دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

**● لە بارەی رۆژنامەنووسیی کوردییەوە**

● نووسینی: حەمەد ساڵح فەرهادی

● نەخشەسازی ناوەوە: تەها حسێن

● بەرگ: مەریوان زەندی

● ژمارەی سپاردن: (٢٧٣٥)

● [illegible]

● چاپی [illegible]

● تیراژ: ٥٠٠ دانە

● چاپخانە: چاپخانەی رۆژهەڵات (هەولێر)

**زنجیرەی کتێب (٥٤٩)**





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ناوەرۆك

# پێشەکی

زۆرجار هەڵبژاردنی ناونیشانێکی گونجاو دەبێتە یەکێك لە گرفتەکانی کتێب، ئەمجارەیان بۆمن وابوو.. لەبەر ئەوەی کتێبەکە چەند بابەتێکی جیاوازی لە لێکۆڵینەوە و رەخنەی رۆژنامەنووسی و وتار و خوێندنەوە و هەڵسەنگاندنی کتێبی رۆژنامەنووسی و بیبلۆگرافیای بەخۆیەوە گرتووە، پێم باش بوو ئەو ناونیشانەی ئێستای بۆ هەڵبژێرم، واتە: (لەبارەی رۆژنامەنووسیی کوردییەوە).. بەڵام لەبەر ئەوەی پرۆفیسۆر دوکتۆر عیزەدین مستەفا رەسووڵ لە ساڵی ١٩٧٣دا کتێبێکی خۆی بە هەمان ناوەوە بە زمانی عەرەبی (حول الصحافة الكردية) بە چاپ گەیاندووە و لەوانە بوو دووبارەکردنەوەی هەمان ناونیشان بۆمن ببێتە مایەی سەرنج و رەخنە، بەڵام خۆشبەختانە رۆژێك لە رۆژەکانی ڤیستیڤاڵی رۆمانی کوردی، کە لەلایەن لقی هەولێری یەکێتیی نووسەرانی کوردەوە لە رۆژانی ٢٧-٢٩/٥/٢٠٠٦دا سازکرا، بابەتەکەم لای دوکتۆر عیزەدین باسکرد و بەڕێزی نەك هەر ئیزنی دام، بەڵکو بە هیچ جۆرێك ئەمەی بە بەربەست نەزانی و زۆر لای ئاسایی بوو.

بابەتەکانی ئەم کتێبە لە نێوان ساڵانی ١٩٩٨-٢٠٠٩دا نووسراون و بەشی زۆریشیان لەکاتی جیاجیا لە رۆژنامە و گۆڤارەکانی کوردستاندا بڵاوکراونەتەوە و لێرەش ئاماژەم پێیان کردووە.

سەبارەت بە بابەتە رەخنەییەکانیش، بۆ ئەوەی خوێنەری بەڕێز بە تەواوی لەسەرو بەندی بابەتەکان ئاگادار بێت، وەڵامی ئەو بەڕێزانەشم بڵاوکردووەتەوە کە رەخنەکانیان رووبەڕوو کراوەتەوە، چونکە گومان لەوەدا نییە کە رەخنە و وەڵامەکان هەموویان بۆ دیارکردنی راستییەکانن و لە ئەنجامدا بۆ خزمەتی کاروانی رۆژنامەنووسیی کوردی دەگەڕێنەوە و هەموو لایەك بە سنگێکی فراوانەوە وەری دەگرن.

**حەمە ساڵح فەرهادی**

# دەفتەری کوردەوار

هەرچەندە ڕێککەوتننامەی ١١ی ئاداری ساڵی ١٩٧٠ دەرگای لەبەردەم ڕۆشنبیری و ڕۆژنامەنووسیی کوردی والآکرد، بەڵام جموجۆڵی ڕۆشنبیری هەر لە سەرەتای ساڵەکەوە هەستپێکرا، ئەوەبوو لە مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٠دا ڕۆژنامەی (هاوکاری) وەکو ڕۆژنامەیەکی هەفتانەی کوردی لەلایەن وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی عێراقەوە دەرچوو، هەر لەم مانگەشدا ژمارەی یەکەمی (دەفتەری کوردەواری) دەرچوو، لە مانگی شوباتی هەمان ساڵیشدا یەکێتیی نووسەرانی کورد دامەزرا.

ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە باسی بکەین و تیشکێکی بخەینە سەر، (دەفتەری کوردەواری)یە.

(دەفتەری کوردەواری) هەروەکو لەژێر ناوەکەیدا نووسراوە: (کۆمەڵە نووسینێکی ئەدەبی و زانستی و بیری کوردییە، ڕێگەی ئامانجی کوردایەتیی ئەمڕۆ و سبەینێمان بە پرشنگی بیری نوێ ڕووناك دەکاتەوە، بە ڕوخسارێکی نەتەوەیی و ناوەڕۆکێکی مرۆڤایەتی خۆی دەنوێنێ).

(دەفتەری کوردەواری) لە بەغدا دەرچووە و سێ بەرگی بەم شێوەیەی خوارەوە لێ بڵاوکراوەتەوە:

بەرگی یەکەم لە مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٠ بە ١٢٢ لاپەڕەی قەبارە ٢١*١٤ سانتیمەتر دەرچووە و لە چاپخانەی (ئەسعەد) لە بەغدا چاپکراوە و نرخی ٢٠٠ فلسە.

بەرگی دووەمی لە مارت و نیسانی هەمان ساڵدا بە ١٦٠ لاپەڕەی هەمان قەبارە دەرچووە و هەر لە چاپخانەی (ئەسعەد) چاپکراوە و نرخی ١٥٠ فلسە. بەرگی

سێیەمیشی لە مایس-ئاغستۆسی هەمانساڵ بە ١٦٠ لاپەڕەی قەبارە ٢٢*١٤ سانتیمەتر دەرچووە و لە چاپخانەی (الزوراء) چاپکراوە و نرخی ١٥٠ فلس بووە.

(دەفتەری کوردەواری) لە لاپەڕەی یەکەمی بەرگی یەکەم و دووەمدا نووسراوە: (لەژێر چاودێری و ئامادەکردنی جەمال خەزنەدار لە چاپدراوە)، بەڵام لە لاپەڕەی یەکەمی بەرگی سێیەمدا، کە دوابەرگییەتی، نووسراوە:

سەرنووسەر: دوکتۆر مارف خەزنەدار.

خاوەن و سکرتێری نووسین: جەمال خەزنەدار.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش: ئایا (دەفتەری کوردەواری) گۆڤار بووە یان نا؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، هەروەکو لەمەوبەر ئاماژەمان بۆ کرد، لەژێر ناوەکەیدا نووسراوە: کۆمەڵە نووسینێکی ئەدەبی و زانستی و بیری کوردییە) و نەنووسراوە (گۆڤارێکی زانستی و ئەدەبی و بیری کوردییە) و لەجیاتی (ژمارە) (بەرگ) نووسراوە. بەڵام لە بەرگی سێیەمدا، هەروەکو گوتمان، سەرنووسەر و سکرتێری نووسینی بۆ دانراوە و لەگەڵ (بەرگ)ەکەشدا ژمارە (٣)ی لەسەر نووسراوە.

کاك جەمال خەزنەداری خاوەن و سکرتێری نووسینی (دەفتەری کوردەواری) لە (روونکردنەوەیەك)ی بەرگی سێیەمدا دەڵێ: ((... بەڵام ئێستا کە ماوەی ئەوە هەیە کە دەفتەری کوردەواری ببێ بە گۆڤار بە رەسمی، ئەمە شتێکی ئەوەندە گرنگ نییە، با جارێ وابمێنێ، جیاوازی لە نێوان بڵاوکراوەو گۆڤاردا نییە))[1].

بۆ زیاتر روونکردنەوەی ئەمە، هەمان پرسیارم لە پرۆفیسۆر دوکتۆر مارف خەزنەدار کرد: ئایا (دەفتەری کوردەواری) گۆڤار بووە یان نا؟

بەڕێزی لە وەڵامدا گوتی: گۆڤار بووە، بەڵام لەبەر ئەوەی مۆڵەتی رەسمیمان بۆ وەرنەگرتبوو و تەنیا بە زار (شەفیق کەمالی)ی وەزیری ئەوسای رۆشنبیری و راگەیاندنی عێراقم ئاگادار کردبووەوە، بۆیە لەجیاتی گۆڤار ناوی بڵاوکراوەمان لەسەر دەنووسی.[2] شایانی باسە پاشتر جەمال خەزنەدار لە کتێبی (رابەری رۆژنامەگەریی کوردی) و دوکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد لە کتێبی (تێگەیشتنی

راستی و شوێنی له ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا) هەردووکیان (دەفتەری کوردەواری) یان هەر بە گۆڤار داناوە[٣].

کە لاپەڕەکانی هەرسێ بەرگی (دەفتەری کوردەواری) هەڵدەدەینەوە دەبینین بەڕاستی بڵاوکراوەی (نوخبە) بووە و زۆربەی ئەوانەی بابەتیان تێدا بڵاوکردووەتەوە لە نووسەر و کەسایەتییە ناسراوەکانی حەفتاکان بوون.. لە رووی ناوەڕۆکیشەوە (دەفتەری کوردەواری) یەکێکە لە گۆڤارە هەرە دەوڵەمەندەکانی کوردی و ئەگەر لەسەر هەمان رێڕەو بەردەوام بووایە و نەوەستابایە دەبووە دیاردەیەکی نوێی رۆژنامەنووسی کوردی و سەرچاوەیەکی متمانە پێکراو لە رووی ئەکادیمییەوە.

(دەفتەری کوردەواری) گۆڤارێکی ئازاد بووە و لاپەڕەکانی بۆ هەموو رۆشنبیر و نووسەرێکی کورد و بابەتی بە پێز کراوە بووە، هەڵسووڕێنەرانی لە هەرسێ ژمارەدا ئەوەیان دووپات کردووەتەوە کە پێشوازی لە هەموو نووسینێکی باش دەکەن: (ئەو کەرەستانەی لەناو لاپەڕەکانی دەفتەری کوردەواریدا بڵاودەکرێنەوە بیروڕای نووسەرەکانیانن. لاپەڕەکانی ئەم دەفتەرە کراوەیە بۆ هەموو رۆشنبیر و خوێندەوارێکی کورد، دیوانەکەی ئاواڵەیە بۆ کۆبوونەوەی خوێندەواری، بۆ گفتوگۆکردن، بیروڕا دەربڕین، رەخنەگرتن لە پێناوی سەرخستن و بەرزکردنەوەی نەتەوەی کوردی خۆشەویستمان[٤].

ناوەڕۆکی بابەتەکانی (دەفتەری کوردەواری) هەمە جۆرن، بەڵام گرنگییەکی تایبەتی بە لێکۆڵینەوەو رەخنەی ئەدەبی و بابەتی مێژوویی و زمانەوانی داوە، گۆڤارەکە خۆی ئەمەی لە نووسەران ویستووە: (بۆ خوێندەواران: لەم ماوەیەدا گەلێ کەرەستەی بڵاوکردنەوەمان بۆ هاتووە، بەڕێز ئەوانەی بە کەڵك بن بڵاویان دەکەینەوە، تکاش لەوانە دەکەین کە وتارمان بۆ دەنێرن، زیاتر خەریکی لێکۆڵینەوە و رەخنە بن، وتاری مێژوویی و دەسنووس و وێنەی بڵاونەکراوە بنێرن، لەمەودوا ئەم بڵاوکراوەیە زۆرتر بایەخ بە باسی ئەکادیمی ئەدا نەوەکو داهێنان واتە (هەڵبەست و پەخشان)[٥].

ئەو نووسەرانەی بابەتیان لە (دەفتەری کوردەواری)دا بڵاوکردووەتەوە بەم شێوەیەن:

١- ئەوانەی لە هەرسێ ژمارەدا بابەتیان هەیە:

د. پاکیزە رەفیق حیلمی، جەمال خەزنەدار، د. مارف خەزنەدار، شێخ محەمەدی خاڵ، محەمەد مەولوود (مەم).

٢- ئەوانەی لە دوو ژمارەدا بابەتیان هەیە:

ئەحمەد خواجە، د.ئیحسان فوئاد، ئیسماعیل رەسووڵ، جەمال بابان، شێرکۆ بێکەس، مستەفا ساڵح کەریم، د.موکەڕەم تاڵەبانی، شێخ مارف بەرزنجی.

٣- ئەوانەی تەنیا لە یەك ژمارەدا بابەتیان هەیە:

د.ئەحمەد عوسمان، حەمید عوسمان، ساڵح حەیدەری، د.عیزەدین مستەفا رەسووڵ، د.قەناتی کوردۆ، د.نەسرین فەخری، حوسێن عارف، د.حوسێن عەلی مەحفووز، شکور مستەفا، شێرۆ موفتی، عاسم حەیدەری، کاکەی فەللاح، مەسعوود محەمەد، محەمەد ئەمین عوسمان، محەمەد رەسووڵ (هاوار)، محەمەد ساڵح دیلان، محەمەدی مەلا کەریم، مومتاز حەیدەری، نووری شێخ جەلال، نووری عەلی ئەمین، ع. ع. شەونم، عەبدولمەجید عەبدولڕەحمان، جەمال نووری، سادق بەهائەدین ئامێدی، کەریمی حوسامی، ئەحمەد غەفوور، س. ع. شادمان، ئەحمەد دڵزار، عومەر مارف بەرزنجی، د.نووری تاڵەبانی، کەریم شارەزا.

لێکۆڵینەوە و رەخنەی ئەدەبی شوێنێکی دیاریان لە (دەفتەری کوردەواری)دا هەیە، لە (٤٤٢) لاپەڕەی هەر سێ ژمارەی گۆڤارەکە (١٣٤) لاپەڕەی بۆ لێکۆڵینەوە و رەخنەی ئەدەبی تەرخانکراوە، ئەمەش دەکاتە زیاتر لە ١/٤ی هەموو لاپەڕەکانی گۆڤارەکە، ئەم گرنگی پێدانە تایبەتییە لە کەم گۆڤاری دیکەدا هەستی پێ دەکرێ.

(شێخ رەزای تاڵەبانی) بابەتێکی بە پێزی شێخ محەمەدی خاڵ بە سێ بەش لە هەرسێ ژمارەی (دەفتەری کوردەواری)دا بڵاویکردووەتەوە، مامۆستا خاڵە لە لێکۆڵینەوەکەدا، سەرەڕای کورتەی ژیان و بەسەرهاتی شێخ رەزا، چەندین نموونەی شیعریشی بە کوردی و فارسی و عەرەبی و تورکی هێناوەتەوە و بۆنەی گوتنیانی روون کردووەتەوە(٦).

(قسه هەزارە دووانی بەکارە) لێکۆڵینەوەیەکە لەبارەی پەندی پێشینانی کوردی، ئەم بابەتە مامۆستا جەمال بابان نووسیویەتی و تێیدا پێناسەی پەندی پێشینان دەکات و جۆرەکانی دەستنیشان دەکات و شوێنی پەندی پێشینان لە ئەدەبی کوردیدادیار دەکات و ناوی ئەو کەسانەش دێنێ کە بەر لەو باسی پەندی پێشینانی کوردییان کردووە، لە کۆتاییدا چەندین نموونەی پەندی پێشینانی هێناوەتەوە. ئەم بابەتە لە لاپەڕە (٦٢-٨٤)ی بەرگی یەکەمدا بڵاوکراوەتەوە.

شایانی باسە لە هەمان ژمارەدا بابەتێکی دیکەش هەر بۆ ئەدەبی فۆلکلۆری تەرخانکراوە، بابەتەکە بەناوی (لێکۆڵینەوەیێك لە ئەدەب و ئەدەبی فۆلکلۆری)یە و خوالێخۆشبوو ئیسماعیل رەسووڵ نووسیویەتی[(٧)].

بابەتێکی دیکەی لێکۆڵینەوە لە ژمارە (١)ی (دەفتەری کوردەواری)دا بابەتێکە لە بارەی (عەلی هەریری)یەوە، ئەم بابەتە دوکتۆر عیزەدین مستەفا رەسووڵ نووسیویەتی و لاپەڕە (٩٨-١٠٦)ی ژمارەکەی بۆ تەرخانکراوە. نووسەر لە لێکۆڵینەوەکەیدا باسی ئەوە دەکات کە کۆنترین سەرچاوەی کوردی کە تا ئێستا بەدەستەوە بێت و ناوی عەلی هەریری هێنابێ (مەم و زین)ی ئەحمەدی خانییە و دوای ئەمیش حاجی قادری کۆیی بەم جۆرە باسی عەلی هەریری کردووە:

دوو عەلین شاعیرن وەکو حەسسان

بەردەشان و حەریرە مەسکەنیان

ئەمە و بابەتەکە ژیان و رای نووسەران و هەندێك نموونەی شیعریی عەلی هەریریشی گرتووەتەوە و بە (لێکۆڵینەود و ئەنجام)ێکیش کۆتایی هاتووە.

(کەیفی جوانڕۆیی) بابەتێکی بە پێز و تێروتەسەلە لە بارەی (کەیفی)ی شاعیرەوە، ئەم بابەتە مامۆستا مەسعوود محەمەد نووسیویەتی و (٢٣) لاپەڕەی بەرگی یەکەمی بۆ تەرخانکراوە. مامۆستا مەسعوود محەمەد لە نووسینەکەیدا باسی ژیانی کەیفی، لە دایکبوون و مردنی، خوێندنی لە کۆیە لای حاجی مەلا عەبدوڵڵای کۆیی، تێکچوونی نێوانی لەگەڵ شێخ رەزای تاڵەبانی، بەجێهێشتنی کۆیە و هۆی بەجێهێشتنی و چەند نموونەیەك لە شیعرەکانی کردووە.

مامۆستا محەمەد ئەمین عوسمانیش کورتە باسێکی لە بارەی (ئەحمەد موخلیس)ی شاعیر نووسیوە و نموونەی لە شیعرەکانیشی هێناوەتەوە. ئەم بابەتە بە دیالێکتی کرمانجی ژووروو نووسراوە و لاپەڕە (٧٢-٧٧)ی ژمارە (٢)ی (دەفتەری کوردەواری)ی بۆ تەرخانکراوە.

مامۆستا مومتاز حەیدەریش لە لاپەڕە (١٣٠-١٣٨)ی ژمارە (٢)دا باسێکی (دلدار)ی شاعیری کردووە و تێیدا، وێڕای کورتەی ژیانی شاعیر، چەند نموونەیەکی شیعریشی پێشکەش کردووە.

(عەلی تەرماخی و دەستنووسەکەی) بابەتێکی دوکتۆر مارف خەزنەدارە، نووسەر بابەتەکەی بەم جۆرە دەست پێکردووە: (لێکۆڵینەوە و پشکنینەوەی زانستی بۆ دەرخستنی راستی پێویستییێکی مێژووییە، هەندێ پرس لە ئەدەب و مێژووەکەمانا هەن ئەبێ لێیان بکۆڵرێتەوە، گەلێ چەوتی هەن ئەبێ راست بکرێنەوە. بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجە لەم وتارە بچووکەدا هەندێ تێبینی ئەخەمە روو لە بابەت عەلی تەرماخی و دەستنووسەکەیەوە)[٨].

(رەخنەی ٣ هۆنراوەکەی ژمارەیەکی دەفتەری کوردەواری)

بابەتێکی رەخنەییە مامۆستا عەبدولمەجید عەبدولڕەحمان نووسیویەتی و تێیدا سێ هۆنراوەی ژمارە (١)ی (دەفتەری کوردەواری) هەڵسەنگاندووە، هۆنراوەکانیش ئەمانەن:

١- لە چلەی (گۆران)دا/ د.ئیحسان فوئاد.

٢- کل و گڵ/ حەمیدی عوسمان.

٣- ملیۆنەها و بەڵام/ شێرکۆ بێکەس.

بابەتێکی دیکە هەر لە بارەی (عەلی هەریری)ی شاعیرەوە ئەمجارەیان خوالێخۆشبوو سادق بەهائەددین ئامێدی نووسیوویەتی و بە دیالێکتی کرمانجیی ژووروووە. بابەتەکە بە ناوی (هۆزانڤانێ کلاسیکیێ بناڤو دەنگ عەلی حەریری)یە و لە لاپەڕە (٦١-٧٧)ی ژمارە (٣)ی (دەفتەری کوردەواری)دا بڵاوکراوەتەوە. نووسەر لە لێکۆڵینەوەکەیدا چەند نموونەی شیعریی شاعیری هێناوەتەوە[٩].

(وەلی دێوانە) بابەتێکی س. ع. شادمان نووسیویەتی و لە سەرەتای نووسینەکەیدا ئاماژە بە نەخوێندەواریی وەلی دێوانەی شاعیر دەکات و دەڵێ: (هەرچەندە بلیمەتی و زیرەکی و دانایی بە زۆرترینی لە رووی خوێندەوارییەوە هەڵدەکەوێ، بەڵام لەناو گەلەکەمانا تاکە تاکە شاعیری نەخوێندەوار هەڵکەوتوون.. یەکێك لەو شاعیرە نەخوێندەوارانە (وەلی دێوانە)یە[10]. پاشان نووسەر هەندێك لە شیعرەکانی شاعیری شیکردووەتەوە، لە کۆتاییشدا ئاماژەی بەوە کردووە کە پیرەمێردی شاعیر هەندێك لە شیعرەکانی وەلی دێوانەی لە هەورامییەوە کردووە بە سۆرانی.

دوا بابەتی لێکۆڵینەوە بابەتێکە مامۆستا عومەر مارف بەرزنجییە لە بارەی دیوانی پیرەمێرد بەناوی (دیوانەکەی پیرەمێرد)، ئەم بابەتە لە لاپەڕە (١١٦-١٢٧)ی ژمارە (٣)ی (دەفتەری کوردەواری)دا بڵاوکراوەتەوە.

مێژوو، بەتایبەتی مێژووی کورد و کوردستان، شوێنێکی دیاری لە (دەفتەری کوردەواری)دا هەیە. لە بابەتە مێژووییەکانی: (لاپەڕەیەك لە خەباتی نەتەوەی کورد لە ساڵی ١٩٢٠دا)، ئەم بابەتە دوکتۆر موکەڕەم تاڵەبانی نووسیویەتی و تێیدا باسی لاپەڕەیەکی شاراوە لە هەڵسانی کورد دەکات لە ساڵی ١٩٢٠ لە ناوچەی کفری. نووسەر بابەتەکەی بەم جۆرە دەست پێدەکات: (لە رۆژێك لە دوا رۆژانی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٠ تەقەی تفەنگ لەگەڵ شەبەقی بەیانیدا خەڵکی کفری لەخەو هەڵساند، ئەم خەڵکە چاوەڕوانی راپەڕین بوون، گەلێکیان دەستیان دایە تفەنگ و بە پەیژەکانا چوونە سەربان و لوولەی تفەنگەکانیان لەناو سوولاوکەکانەوە ئاڕاستەی کۆڵانەکانی شار کرد...)[11].

دووەم بابەتی مێژوویی لە (دەفتەری کوردەواری)دا بابەتێکی مامۆستا ساڵح حەیدەرییە بە ناوی (یاداشتێك دەربارەی حیزبی رزگاری کورد کە لە ساڵی ١٩٤٥ لە کوردستانی عێراقدا دامەزرا)، نووسەری بابەتەکە، کە خۆی یەکێك بووە لە دامەزرێنەرانی حیزبی رزگاری، لە دوو توێی نۆ لاپەڕەی گۆڤارەکەدا باسی دامەزراندنی ئەو حیزبە و هەندێك لە چالاکییەکانی دەکات[12].

بابەتێکی دیکەی مێژوویی هەمان ژمارەی (دەفتەری کوردەواری) کە لاپەڕە (٨٥-٨٨)ی ژمارەکەی گرتووەتەوە، بابەتێکی دوکتۆر ئەحمەد عوسمانە بە ناوی (ئایا مێژووی کورد نووسراوەتەوە؟).

نووسەر لە بابەتەکەیدا دەیەوێ ئەوە بسەلمێنێ کە دەست بە نووسینەوەی مێژووی کورد کراوە بەڵام هێشتا لە سەرەتا دایە و هەنگاوی زۆری نەهاویشتووە.

لە بابەتە مێژووییەکانی دیکەی (دەفتەری کوردەواری) دوو بابەتی مێژوویین، یەکەمیان لەبارەی شاری کفری و دووەمیشیان لەبارەی شاری هەولێر، بابەتی یەکەمیان بە ناونیشانی (کفری زەوی بەهاداری و شاری کەساسییە) و لەلایەن دوکتۆر موکەڕەم تاڵەبانییەوە نووسراوە و لاپەڕە (٤-١٢)ی ژمارە (٣)ی پێدراوە، بابەتی دووەمیشی بەناوی (هەولێر کۆنترین شاری جیهانە و دواکەوتووترین شاری ئەو ناوچەیەیە)، ئەم بابەتە مامۆستا جەمال خەزنەدار نووسیویەتی و تێیدا سەرەڕای کورتەیەك لە مێژووی شاری هەولێر و گرنگترین ڕووداوەکانی باسی هەندێك لە شوێنەوارەکانی هەولێریشی کردووە وەك: گلکەند، گردی قارلینج ئاغا، منارەی چۆلی، قەڵای هەولێر، کونە گورگ، ستی ئیمام..هتد. ئەم بابەتە لاپەڕە (١٢٧-١٣٣)ی ژمارە (٣)ی گۆڤارەکەی دراوەتێ.

ژمارە (٣)ی (دەفتەری کوردەواری) کە لە (مارت — نیسان)ی ساڵی ١٩٧٠دا دەرچووە، وێڕای سەروتاری گۆڤارەکە بەناوی (دەست لەناو دەست لەگەڵ نەورۆزدا) و کارتێکی پیرۆزبایی وەکو دیاریی ژمارەکە بە بۆنەی جەژنی نەورۆز و شیعرێك بە هەمان بۆنەوە، هەندێك بابەتی مێژوویی و ئەدەبیشی لە بارەی نەورۆزەوە تێدا بڵاوکراوەتەوە، بابەتەکان ئەمانەن:

١- بیرەوەریی ئاهەنگی نەورۆزی ١٩٤٦/ نووسینی خوالێخۆشبوو عاسم حەیدەری، ل٨-١٤.

٢- نەورۆز لە ئەدەبی گەلاندا/ نووسینی شکور مستەفا، ل٤٢-٥٠.

٣- نەورۆزی ساڵی ١٩٣٠ لە چەمچەماڵدا/ نووسینی نووری شێخ جەلال، ل٨٧-٨٨.

(زمانەوانی)ش لە (دەفتەری کوردەواری)دا گرنگییەکی باشی پێدراوە، ژمارەکانی ئەم بڵاوکراوەیە چوار بابەتی زمانەوانییان بە خۆیانەوە گرتووە، سێ بابەتیان دوکتۆر پاکیزە رەفیق حیلمی نووسیویەتی و یەکێکیشیان لەلایەن دوکتۆر نەسرین فەخرییەوە نووسراوە. بابەتە زمانەوانییەکانی دوکتۆر پاکیزە رەفیق حیلمی ئەمانەن:

١- رێزمان و مێژووی زمانی کوردی، ژ/١، ل٣٣-٤٠.

٢- زانیاری زمان، ژ/٢، ل١٠٠-١٠٦.

٣- زمانی کوردی، ژ/٣، ل١٠٤-١١٠.

بەڵام بابەتەکەی دوکتۆر نەسرین فەخری بەم ناونیشانەیە: (چاوخشاندنێك بەو کتێبانەدا کە لەسەر زمان و رێزمانی کوردی نووسراون)، ژ/١، ل٥٦-٥٩.

هەرچەند، هەروەکو لەمەوبەریش ئاماژەمان بۆی کرد، کە هەڵسووڕێنەرانی گۆڤارەکە لە ژمارە (٢)دا خوێنەریان ئاگادار کردووەتەوە کە لەمەودوا (دەفتەری کوردەواری) زۆرتر بایەخ بە باسی ئەکادیمی دەدات نەوەك داهێنان، واتە هەڵبەست و پەخشان، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە داهێنانی فەرامۆش کردبێت، بۆیە دەبینین گۆڤارەکە لە هەرسێ ژمارەیدا چەندین شیعرو چیرۆك و وتار و پەخشانی ئەدەبیی بڵاوکردووەتەوە.

سەبارەت بە شیعر، لە هەر ژمارەیەکی (دەفتەری کوردەواری)دا سێ هۆنراوە بڵاوکراوەتەوە.. ئەوەی جێگای سەرنجیشە ئەوەیە هەندێك لەوانەی شیعریان تێیدا بڵاوکردووەتەوە، لای ئێمە بە شاعیر نەناسراون، وەکو: حەمید عوسمانی سیاسەتمەدار و محەمەدی مەلا کەریمی نووسەر و رۆژنامەنووس و جەمال نووریی چیرۆکنووس. شیعرەکانی (دەفتەری کوردەواری) بەپێی ژمارەی بڵاوکراوەکە بەم جۆرەن:

ژمارە (١):

لە چلەی گۆراندا / د.ئیحسان فوئاد

کل و گڵ / حەمید عوسمان

ملیۆنەها و بەڵام / شێرکۆ بێکەس

ژماره (٢):

نێرگزی زستان / شێرکۆ بێکەس

بلقی سەر ئاو / کاکەی فەللاح

مامەند سەرلەنوێ عومری تازەی بۆ دەنووسرێ/ محەمەدی مەلا کەریم

ژماره (٣):

٤ی نیسان / ع. ع. شەونم

داپیرە گیان / جەمال نووری

لە ئەشکەوتێکا / کەریم شارەزا

دوکتۆر ئیحسان فوئاد لە شیعری (لە چلەی گۆراندا) ئاوا کۆتایی بە شیعرەکەی دێنێ:

(گۆران) وەك گۆرانی ژیان

وەك شەبەقی بەری بەیان

لە دڵی کوردەوارییا

ناوی نەمری نامرێ

گوڵێکە وەك دروشمی مان

پەڕەی گەشی هەڵناوەرێ

شێرکۆ بێکەسیش لە شیعری (ملیۆنەها و بەڵام) لە بارەی یەکنەگرتنی کورد، هەروەکو مامۆستا عەبدولمەجید عەبدولڕەحمان لە ژمارە (٣)ی هەمان بڵاوکراوەدا دەڵێ: (ئەم هۆنراوەیە زۆر بەخێرایی دەجووڵێت و زمانەکەی توند و تیژ و شۆڕشگێڕە، بە شێوەیەکی تاڵ و تفت دەردمان دەردەخات)[١٣]:

ملیۆنەهاین

بەڵام دوو پێکەوە نەلکاین

ملیۆنەهاین

بەڵام خاوەنی ملیۆنێ

دڵ و ڕێگاین

ملیۆنەهاین

بەڵام هەموو هەر سەرکردەو..

قارەمان و زانا و ئازاین

مامۆستا کەریم شارەزاش لە شیعری (لە ئەشکەوتێکا) باسی ژیانی کۆڵەمەرگی خێزانێکی هەژاری کورد دەکات، خێزانێکی بێکار و برسی، بەڵام هیوای پتەو بە دوارۆژ کە لە سایەی خەباتی خوێناویی نەتەوەکەمان دەگەنە ژیانێکی ئاسوودە و شەفەقی گەشی سپێدەی بەیانیان لێ هەڵدێ:

هەرچەندە ئێستا دەروونمان

دۆزەخە، کوورەی ئاگرە

دنیامان تاریك و تەنگە

شەوە زەنگە

برسینە، رووت و رەجاڵین

بێ رێ و جێ و ماڵ و حاڵین

بەڵام سبەی

خەباتی خوێنینی دەستەی

دڵسۆزەکانی نیشتمان

بۆ هەموومان

ئەبێتە شەفەقی گەشی

سپێدەی سیحراویی بەیان

لەبارەی چیرۆکیش، هەرچەندە ژمارە (١)ی (دەفتەری کوردەواری) هیچ چیرۆکێکی بەخۆیەوە نەگرتووە، بەڵام ژمارە (٢) و (٣) هەر یەکەیان دوو چیرۆکیان تێدا بڵاوکراوەتەوە.. چیرۆکەکانی ژمارە (٢) ئەمانەن:

١- خوویەکی پووچ/ حوسێن عارف.

٢- پێشوازی / محەمەد مەولوود (مەم).

بەڵام چیرۆکەکانی ژمارە (٣) ئەمانەن:

١- ئاهی ئێمە بە کۆتەرە بێت/ جەمال بابان.

٢- بابلێین خەوبوو/ مستەفا ساڵح کەریم.

گۆڤاری (دەفتەری کوردەواری) وەرگێڕانیشی پشتگوێ نەخستووە، ژمارەکانی ئەو بڵاوکراوەیە ئەم بابەتە وەرگێڕدراوانەی بەخۆیەوە گرتووە:

١- تەنگوچەڵەمەی پاڵەوان لە چیرۆکی ئەم سەردەمەدا/ گۆڕینی مستەفا ساڵح کەریم.

٢- تێبینی لە لێکدانەوەیێکی زانیارییەکانی گەزنەفۆن لە بابەت کاردۆخەکانەوە/ ئەم بابەتە دوکتۆر قەناتی کوردۆ بە زمانی رووسی نووسیویەتی و دوکتۆر مارف خەزنەدار کردوویەتییە کوردی.

٣- وشەی (دەفتەر) لە زمان و ئەدەب و کتێبی عارەبی و فارسی و تورکی و کوردیدا/ ئەم بابەتە دوکتۆر حوسێن عەلی مەحفووز لەسەر داوای گۆڤارەکە نووسیویەتی و پاشان کراوەتە کوردی.

٤- محەمەد کورد عەلی و فارس ئەلخووری/ دوکتۆر سەلاحەددین ئەلمونجید نووسیویەتی و لە رۆژنامەی (الحیاة) وەرگیراوە و کراوەتە کوردی.

٥- کوردناسین/ نووسینی کوردناسی فەرەنسەیی تۆما بوواو گۆڕینی دوکتۆر نووری تاڵەبانی.

سەبارەت بە چیرۆك و شیعری وەرگێڕدراویش، گۆڤارەکە چیرۆکێك و شیعرێکی بەخۆیەوە گرتووە، چیرۆکەکە بەناوی (١٠ وەزیر)ە و مامۆستا کەریمی حوسامی کردوویەتییە کوردی، شیعرەکەش بەناوی (لینین)ە مایکۆڤسکی دایناوە و دڵزار کردوویەتییە کوردی.

(دەفتەری کوردەواری) لە بارەی ناودارانیشەوە بابەتی بڵاوکردووەتەوە، گۆڤارەکە لەم رووەوە دوو بابەتی پێشکەشکردووە، یەکێکیان لەبارەی ناودارێکی کوردە کە (گۆران)ی شاعیرە و یەکێکیش ناودارێکی جیهانییە ئەویش (لینین)ە. بابەتی یەکەم

به ناوی (گۆرانی مرۆڤ و تێکۆشەر)ەو ئەحمەد غەفوور نووسیویەتی[١٤]، بابەتی دووەمیش بە ناوی (یادی سەد ساڵەی لەدایکبوونی لینین- لینینی مرۆڤ)ەو جەمال خەزنەدار نووسیویەتی[١٥].

لەبارەی رۆژنامەنووسییەوەش بڵاوکراوەکە لە لاپەڕە (١٠٧-١١٠)ی بەرگی یەکەمیدا بابەتێکی بەناونیشانی (مێژووی رۆژنامەگەری کوردی) بڵاوکردووەتەوە، بابەتەکە لەلایەن مامۆستا جەمال خەزنەدارەوە نووسراوە. ئەم ناونیشانە، هەروەکو نووسەرەکەی ئاماژەی بۆ کردووە، ناونیشانی کتێبێکە لەلایەن نووسەری بابەتەکەوە ئامادەکراوە.

(گەنجینەکانی وڵات) بابەتێکە باسی هەندێك رووەکی سروشتی و بەرهەمی کشتوکاڵی دەکات، ئەم بابەتە خوالێخۆشبوو ئەحمەد خواجە نووسیویەتی و لە لاپەڕە (٧-١١)ی ژمارە (١)دا بڵاوکراوەتەوە.

دوا لاپەڕەکانی ژمارە (٢) و (٣)ی (دەفتەری کوردەواری) بە مێژووی ژیانی نووسەری شەهید شێخ مارف بەرزنجی رازاوەتەوە کە لە کاتی خۆیدا بە دەستخەتی خۆی نووسیوویەتییەوە و بۆ دوکتۆر مارف خەزنەداری ناردووە.

لە وتار و پەخشان و بابەتە هەمە جۆرەکانی دیکەی ژمارەکانی (دەفتەری کوردەواری) ئەو بابەتانەن:

(ئەدەب و بیری ساکار) نامەیەکی چیرۆکنووسی خوالێخۆشبوو محەمەد مەولوود (مەم)ە کە بۆ دوکتۆر مارف خەزنەداری نووسیووە، ئەم بابەتە لە لاپەڕە (٨٩-٩٣)ی ژمارە (١)ی (دەفتەری کوردەواری)دا بڵاوکراوەتەوە و هەروەکو ئاماژەی پێکراوە نزیکەی لاپەڕە و نیوێکی پێشەوەی نامەکە لەلایەن سانسۆرەوە رێگەی بڵاوکردنەوەی نەدراوە.

(لە ژێر سێبەری بێخوددا) بابەتێکی مامۆستا شێرۆ موفتییە تێیدا هەواڵی چاپکردنی دیوانی (بێخود) رادەگەیەنێ، نووسەر بابەتەکەی لە شێوەی پەخشانێکی قافییەدار نووسیووە و لە کۆتایی نووسینەکەیدا روو لە خوێنەری خۆشەویست دەکات و دەڵێ:

(یاخوا پیرۆزت بێ ئەم دیارییە، ئەم دیوانە، ئەم تاقە گوڵە نازدارە، کە چنراوە لەو مێرگ و مێرخوزارە، کە ئەڵێی گوڵشەنی بە هەشتی ئاودارە، کە لە دڵی هەموو دڵپاکێدا دیارە...)[١٦].

(رەخنەی بێ سوود) بابەتێکی خوالێخۆشبوو ئیسماعیل رەسووڵە لە لاپەڕە (٩٧-٩٩)ی ژمارە (٢)ی بڵاوکراوەکەدا بڵاوکراوەتەوە.

(یادداشتی جگەرەکێشیێ) پەخشانێکی مامۆستا نووری عەلی ئەمینە تێیدا نارەزایی بەرانبەر بە جگەرە دەردەبڕێ و زیانەکانی دەستنیشاندەکات. نووسەر بابەتەکەی بەم جۆرە دەستپێدەکات: (خۆم خۆم کوشت.. خۆم بەدەستی خۆم ئاگرم بەردایە ماڵی خۆم.. خۆم سەرم لەخۆم و منداڵەکانم شێواند.. زۆریان پێ وتم و کەمم بیست.. ئەوەی منی کوشت.. منداڵەکانمی هەتیو خست.. ملۆزمێکی نالەباری ژەهراوی بوو.. ناوی پیرۆزی (جگەرە) بوو)[١٧].

(هەندێ یادگاری ئەدەبی) بابەتێکی دوکتۆر ئیحسان فوئادە لە ژمارە (٢) لاپەڕە (١١٧-١٢٣)دا بڵاوکراوەتەوە و لە کۆتایی وتارەکەدا نووسراوە (ماویەتی)، کەچی بەشی دووەمی لە ژمارە (٣)دا، کە دوا ژمارەی گۆڤارەکەیە، بڵاونەکراوەتەوە.

(نامەیێکی گۆران بۆ پیرەمێرد) بابەتێکی مامۆستا محەمەد رەسووڵ (هاوار)ە تێیدا باسی نامەیەك دەکات کە (گۆران) لە هەڵەبجەوە لە ساڵی ١٩٣٢ بۆ (پیرەمێرد)ی نووسیوە، هەروەکو لە نامەکەدا بەدیار دەکەوێ گۆران زۆر بە ئەدەب و نوازشەوە روو لە پیرەمێرد دەکات و دەڵێ: (ئوستادی موحتەرەم، رەنگە لە بیریشتان چووبێت: هاوینی رابوردوو، لە دوکانی حەمە ئاغای عەتار، بە مولاقاتێکی بچووکتان، فەیزی گەورەم چنگ کەوت... بەرامبەر بە مەلەکەی شیعرم لە زینی تەشویقا موتەفائیل دیاربوون..)[١٨].

(نامەیێکی کۆن) پارچە پەخشانێکی رۆمانتیکییە شاعیری خوالێخۆشبوو (محەمەد ساڵح دیلان) نووسیویەتی و لە ژمارە (٢) لاپەڕە (١٣٩-١٤١)دا بڵاوکراوەتەوە.

(رۆژی ئاشتی) کورتە بابەتێکە لە بارەی رێککەوتننامەی ١١ی ئاداری ساڵی ١٩٧٠ و روونکردنەوەی چەند بەندێك لە ناوەڕۆکەکەی. ئەم بابەتە لاپەڕە (١٥٤-١٥٥)ی ژمارە (٢)ی گۆڤارەکەی گرتووەتەوە.

(هەندێك شتی وردیلە) نووسینی محەمەد مەولوود (مەم)ە تێیدا باسی هەندێك خوو و رەوشت و هەڵسوکەوت دەکات. (ژ/٣، ل١٣-٢٠)

(گۆشتی بۆ تۆ ئێسقانی بۆ من) بابەتێکی خوالێخۆشبوو ئەحمەد خواجەیە تێیدا باسی خوێندنی جاران و هەندێك لەو پیشە دەستییانە دەکات کە بەرەو نەمان دەچن. بابەتەکە لاپەڕە (٤٥-٤٨)ی ژمارە (٣)ی گرتووەتەوە.

(هەندێ لە شیرازەکانی دەفتەری رەخنەم) بابەتێکە دوکتۆر مارف خەزنەدار نووسیویەتی.. بابەتەکە، هەروەکو نووسەر خۆی دەڵێ: بریتییە لە کۆمەڵە تێبینییەك لە بابەت هەندێك لەو بیروڕایانەی کە لە گۆڤار و رۆژنامەکاندا نووسراونەتەوە. (ژ/٣، ل٤٩-٥٧)

دوا بابەتی ژمارەکانی بڵاوکراوەی (دەفتەری کوردەواری) کە پێویستە ئاماژەی بۆ بکرێ (نامەیێکی کراوە)یە لەلایەن دوکتۆر قەناتی کوردۆی سەرۆکی بەشی کوردناسی لە ئامۆژگای رۆژهەڵاتناسی ئەکادیمییەی زانستی سۆڤیەتەوە نووسراوە و تێیدا پیرۆزبایی رێککەوتننامەی ١١ی ئادار دەکات. (ژ/٣، ل١٢٣-١٢٦).

ئەمە و بڵاوکراوەی (دەفتەری کوردەواری) چەند هەواڵی رۆشنبیری و پرۆپاگەندەیەکیشی تێدا بڵاوکراوەتەوە، پرۆپاگەندەکە بۆ کارگەی کاشیی شیمالە لە بەغدا و بە زمانی عەرەبی نووسراوە.

## سەرچاوەکان


* لە گۆڤاری (کاروان) ژمارە (١٤٤)دا بڵاوکراوەتەوە.

١- دەفتەری کوردەواری/ بەرگی سێیەم، ل٣.

٢- ئەو پرسیارەم لە دووەم ڕۆژی جەژنی قوربانی ساڵی ٢٠٠٠ لە بەڕێز دوکتۆر مارف کرد.

٣- دەربارەیان بڕوانە:

أ- ڕابەری ڕۆژنامەگەریی کوردی/ چاپی بەغدا ١٩٧٣، ل١١٠.

ب- تێگەیشتنی ڕاستی، چاپی بەغدا، ١٩٧٨، ل٢٥١.

٤- دەفتەری کوردەواری، ژ/١، دوالاپەڕە، ژ/٢، ل١٥٧، ژ/٣، ل٩٨.

٥- هەمان سەرچاوە، ژ/٢، ل١٥٧.

٦- هەمان سەرچاوە، ژ/١، ل١٢-١٧، ژ/٢، ل٨٣-٨٦، ژ/٣، ل١١١-١١٥.

٧- هەمان سەرچاوە، ژ/١، ل١١١-١٢٠.

٨- هەمان سەرچاوە، ژ/٢، ل١٤٢-١٤٤، (شایەنی باسە ئەم دەستنووسەی عەلی تەرماخی لە دواییدا بڵاوکرایەوە. بڕوانە: (دەستووری زمانی کوردی، عەلی تەرماخی، لێکۆڵینەوە و لەسەر نووسین و ئامادەکردنی بۆ چاپ دوکتۆر مارف خەزنەدار، بەغدا ١٩٧١).

٩- هەمان سەرچاوە، ژ/٣، ل٣٧-٤٢.

١٠- هەمان سەرچاوە، ژ/٣، ل٩٣-٩٨.

١١- هەمان سەرچاوە، ژ/١، ل١٨.

١٢- هەمان سەرچاوە، ژ/١، ل٤٧-٥٥.

١٣- هەمان سەرچاوە، ژ/٣، ل٤١.

١٤- هەمان سەرچاوە، ژ/٣، ل٨٩-٩٢.
١٥- هەمان سەرچاوە، ژ/٢، ل٤-٧.
١٦- هەمان سەرچاوە، ژ/٢، ل٧٨-٨٢.
١٧- هەمان سەرچاوە، ژ/٢، ل١١٣-١١٦.
١٨- هەمان سەرچاوە، ژ/٢، ل١٢٤-١٢٩.

# رۆژنامەنووسی منداڵان دوای ڕاپەڕین*

**پێشەکی:**

کە باسی قۆناغی دوای ڕاپەڕینی رۆژنامەنووسی منداڵان دەکەین، واتە باسی سێزدە ساڵی تەمەنی ئەو بەشەی رۆژنامەنووسی کوردی دەکەین، ئەم ماوەیەش هەرچەندە بە ژمارەی ساڵ کەمە و کەمتر لە ۱/۳ی تەمەنی رۆژنامەنووسی منداڵان دەگرێتەوە، بەڵام بە ژمارەی بڵاوکراوەکان و چڕوپڕی لە دەرچوون دەکاتە زیاتر لە شەش ئەوەندەی ژمارەی هەموو ئەو گۆڤار و بڵاوکراوانەی کە پێش ڕاپەڕین دەرچوونە، بۆیە جێی خۆیەتی ئەم سەردەمە بە سەردەمێکی زێڕینی رۆژنامەنووسی منداڵان دابنێین. دیارە ژمارەی گۆڤارەکانی تایبەت بە منداڵان پێش ڕاپەڕین ناگاتە ژمارەکانی پەنجەکانی هەردوو دەستی مرۆڤێك و هیچ یەکێکیشیان لە سێ ژمارە زیاتریان لێ دەرنەچووە.

**پێناسە:**

دەتوانین بە کورتی پێناسەی گۆڤاری منداڵان بەوە بکەین کە: کۆمەڵە بابەتێکی هەمە جۆری تایبەت بە منداڵانە بە زنجیرە لە کات و شوێنی دیاریکراودا دەردەچێت.

**تایبەتمەندییەکانی:**

۱- منداڵ لەکاتی سەرنجدانیدا، گۆڤارەکە بە هی خۆی بزانێت.
۲- بابەتەکانی لە بارەی ورد و درشتی پیتەکانییەوە لەگەڵ قۆناغی منداڵدا بگونجێ.
۳- ئەگەر بکرێ بۆ تەمەنێکی دیاریکراوی منداڵ بێت.

٤- بابەتەکان وێنەی جوان و ڕەنگاو ڕەنگیان لەگەڵدا بێت.
٥- بابەتەکان هەمەجۆربن و ڕەنگدانەوەی ئایدۆلۆژیایەکی دیاریکراو نەبێت، واتە نەیەوێت بیرۆکەیەکی تەسك و حزبایەتی بەسەر منداڵدا بسەپێنێ.
٦- زمانەکەی پاراو بێت و وشە و دەستەواژەکانی لە فەرهەنگی منداڵەوە هەڵقوڵابن.
٧- نرخی گونجاو بێت و بە ئاسانی بگاتە دەستی منداڵان.

**پێش ڕاپەڕین:**

ئەگەر زۆر بەکورتیش بێت پێویستە ئاماژە بۆ ئەو گۆڤارانە بکەین کە پێش ڕاپەڕین دەرچوونە، ئەمانیش:

١- گروگاڵی منداڵانی کورد:
شوێنی دەرچوون/ مهاباد
ساڵی دەرچوون/ بەهاری ١٩٤٦
سێ ژمارەی لێ دەرچووە.

٢- گۆڤاری (ئەستێرە):
شوێنی دەرچوون/ سلێمانی
ساڵی دەرچوون/ ١٩٧٢
سێ ژمارەی لێ دەرچووە.

٣- گۆڤاری (ئەستێرە):
شوێنی دەرچوون/ بەغدا
ساڵی دەرچوون/ مایسی ١٩٧٥
دوو ژمارەی لێ دەرچووە، بەڵام ژمارە (٢)ی پێش بڵاوکردنەوەی حکوومەتی عێراق دەستی بەسەرداگرت و قەدەغەی کرد.

٤- گۆڤاری (ئەستێرە):
شوێنی دەرچوونی/ شاخ
دوو ژمارەی لێ دەرچووە.

٥- گۆڤاری (کۆچەر):
شوێنی دەرچوونی/ سوێد
ساڵی دەرچوون/ ١٩٨٨.

٦- کاروانی منداڵان:
شوێنی دەرچوونی/ هەولێر
ساڵی دەرچوون/ ١٩٩٠
دوو ژمارەی لێ دەرچووە.

جگە لەم گۆڤارانەی سەرەوە، ناوە ناوەش چیرۆك و شیعر و شانۆگەریی منداڵان لە رۆژنامە و گۆڤارە گشتییەکاندا بڵاوکراوەتەوە، هەروەها دوو کۆمەڵە بەرهەمی منداڵانیش لەلایەن چەند نووسەرێکەوە بڵاوکراوەتەوە.

**دوای راپەڕین:**

١- گۆڤاری (پەڕەسێلکە):
شوێنی دەرچوون/ هەولێر
لە نێوان ساڵانی (١٩٩١-١٩٩٥) شەش ژمارەی لێ بڵاوکراوەتەوە.

٢- گۆڤاری (خاڵخاڵۆك):
شوێنی دەرچوون/ دهۆك
ساڵی دەرچوون/ ١٩٩١.

٣- گۆڤاری (ئەستێرە):
شوێنی دەرچوون/ سلێمانی
ساڵی دەرچوون/ ١٩٩٢
یەك ژمارەی لێ دەرچووە.

٤- گۆڤاری (پەپوولە):
شوێنی دەرچوون/ سلێمانی
ساڵی دەرچوون/ ١٩٩٢
تا ئێستاش بەردەوامە.

٥- پەریستان:
پاشکۆی رۆژنامەی (کوردستانی نوێ) بووە.
ساڵی دەرچوون/ ١٩٩٣
١٢ ژمارەی لەگەڵ رۆژنامەکە دەرچووە و ژمارە (١٣-٤٥)ی وەکو پاشکۆ دەرچووە، پاشانیش بووەتە گۆڤارێکی مانگانە.

٦- گۆڤاری (ئەستێرە):
شوێنی دەرچوون/ سوێد
لەلایەن (کاکە باس)ەوە دەرچووە.

٧- گۆڤاری (هەنگ):
وەزارەتی رۆشنبیری حکوومەتی هەرێمی کوردستان دەریدەکات.
شوێنی دەرچوون/ هەولێر
ساڵی دەرچوون/ ژمارە (١)ی لە ١٩٩٣/٣/٢٥ دەرچووەو تا ئێستاش بەردەوامە.

٨- گۆڤاری (جگەرگۆشەکان):

یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان دەریدەکات

سەرەتا لەگەڵ گۆڤاری (پەیامی راستی) و پاشان وەکو پاشکۆیەك و دواتریش وەکو گۆڤارێکی سەربەخۆ دەرچووە.

شوێنی دەرچوون/ سلێمانی

ساڵی دەرچوون/ ١٩٩٣

تا ئێستاش بەردەوامە و ئێستا لە هەولێر دەردەچێت.

٩- بڵاوکراوەی (گوڵزار):

پاشکۆی هەفتەنامەی (گوڵان) بووە

شوێنی دەرچوون/ هەولێر

ساڵی دەرچوون/ ئابی ١٩٩٤

یەك ژمارەی لێ دەرچووە.

١٠- گۆڤاری (هێڤی):

رۆژنامەی (کوردستانی نوێ) دەریکردووە.

شوێنی دەرچوون/ هەولێر

مێژووی دەرچوون/ ژمارە (١)ی لە ئەیلوولی ١٩٩٥ دەرچووە

چوار ژمارەی لێ بڵاوکراوەتەوە.

١١- گۆڤاری (ئاوات و هێڤی):

رێکخراوی M. A. G دەریکردووە

شوێنی دەرچوون/ سلێمانی

تایبەت بوو بە (مین) و کارەساتەکانی، هەندێك ژمارەی بە شێوەی کرمانجی خواروو و هەندێکیشی بە شێوەی کرمانجی ژووروو دەرچووە.

بۆ فرۆشتن نەبووە و بە خۆڕایی دابەشکراوە.

١٢- هەفتەنامەی (گدیلە):

وەزارەتی رۆشنبیری هەرێمی کوردستان دەریکردووە.

شوێنی دەرچوون/ هەولێر

ساڵی دەرچوون/ ژمارە (١)ی لە ١٩٩٨/٣/٩ دەرچووە

چوار ژمارەی لێ بڵاوکراوەتەوە.

١٣- گۆڤاری (جریوە):

وەزارەتی رۆشنبیری هەرێمی کوردستان بە هاوکاری لەگەڵ رێکخراوی سۆسیال دیموکراتی مەسیحی دەریدەکرد.

شوێنی دەرچوون/ سلێمانی

ساڵی دەرچوون/ ژمارە (١)ی لە ئاداری ١٩٩٨ دەرچووە.

چەند ژمارەیەکی لێ بڵاوکراوەتەوە.

١٤- بڵاوکراوەی (رۆژ):

کۆمەڵەی منداڵانی کرێکار دەریکردووە

شوێنی دەرچوون/ هەولێر

ساڵی دەرچوون/ ١٩٩٨.

١٥- گۆڤاری (سڤۆرە):

سەرەتا لەلایەن دەزگای راگەیاندنی (کازی) دەرچووە

شوێنی دەرچوون/ دهۆك

ساڵی دەرچوون/ ژمارە (١)ی ساڵی ١٩٩٨ دەرچووە.

تا ئێستاش بەردەوامە.

١٦- بڵاوکراوەی (نێرگز):

رێکخراوی منداڵپارێزانی کوردستان دەریکردووە.

شوێنی دەرچوون/ هەولێر

ساڵی دەرچوون/ ١٩٩٩.

١٧- هەفتەنامەی (هێلانەی منداڵان):

دەزگای رۆژنامەنووسی خەبات و برایەتی دەریدەکات.

شوێنی دەرچوون/ هەولێر

ساڵی دەرچوون/ ١٩/٨/٢٠٠٠

پێنج ژمارەی بەرایی لەگەڵ رۆژنامەی (برایەتی) دەرچووە و, پاشان وەکو پاشکۆیەکی سەربەخۆ.

تا ئێستاش بەردەوامە.

١٨- گۆڤاری (تان تان):

شوێنی دەرچوون/ سلێمانی

ساڵی دەرچوون/ ٢٠٠٠

بۆ مێردمنداڵانی تەمەن (١٠-١٨) ساڵانە.

١٩- پەیامی منداڵ:

کۆمەڵەی منداڵپارێزی کوردستان دەریکردووە.

شوێنی دەرچوون/ هەولێر
ساڵی دەرچوون/ ژمارە (سفر)ی لە ٢٠٠١ دەرچووە.

٢٠- گۆڤاری (پەلکە زێڕینە):
ڕێکخراوی ڕۆشنبیری یاسایی دەریدەکات.
شوێنی دەرچوون/ هەولێر
ساڵی دەرچوون/ ژمارە (١)ی لە حوزەیرانی ٢٠٠١ دەررچووە.
تا ئێستاش بەردەوامە.

٢١- بڵاوکراوەی (مرواری):
شوێنی دەرچوون/ هەولێر.
کاك (عوسمان عەبدوڵڵا قەڵادزەیی) بە تەنیا چەند ژمارەیەکی لێ دەرکردووە، هەندێکی بە دەستنووس و هەندێك بە کۆمپیوتەر.

٢٢- گۆڤاری (زەنگ و بەنگ):
شوێنی دەرچوون/ دهۆك
ساڵی دەرچوون/ ژمارەی(١)ی لە ئەیلوولی ٢٠٠١ دەرچووە.

٢٣- گۆڤاری (کۆلارە):
بۆ منداڵانی سەرووی ٩ ساڵانە
شوێنی دەرچوون/ سلێمانی
ساڵی دەرچوون/ ژمارە (١)ی لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٢ دەرچووە.
گۆڤارێکی ئەهلییە.

پاشکۆیەکی بەناوی (ترش و شیرین) هەیە، کە تایبەتە بە مەتەڵ و یاریی هزرو بینین. ژمارە (١)ی ئەم پاشکۆیە لە ٢٠٠٢/١٠/٢٥ دەرچووە.

٢٤- گۆڤاری (خەندە):
شوێنی دەرچوون/ سلێمانی
ساڵی دەرچوون/ ژمارە (١)ی لە شوباتی ٢٠٠٢دا دەرچووە.

٢٥- گۆڤاری (سندیبادی بەغدا):
شوێنی دەرچوون/ بەغدا
بابەتەکانی ئەم گۆڤارە لە عەرەبییەوە کراون بە کوردی.

٢٦- دنیای منداڵ:
رۆژنامەی (کوردستان)ی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران دەریکردووە.
ساڵی دەرچوون/ ٢٠٠٢.

٢٧- گۆڤاری (کەناری):
گۆڤارێکی ئەهلییە
شوێنی دەرچوون/ سلێمانی

٢٨- گۆڤاری (ئاگا):
لەلایەن رێکخراوی (کۆما)وە دەرچووە و تایبەتە بە شارەزا بوون و ئاگادارکردنەوە لە مەترسییەکانی (مین).
شوێنی دەرچوون/ هەولێر
ساڵی دەرچوون/ ژمارە (سفر)ی لە ٢٠٠٢ دەرچووە.

٢٩- گۆڤاری (نێرگز):

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی (بەدرخان) دەریکردووە.

شوێنی دەرچوون/ سلێمانی

ساڵی دەرچوون/ ژمارە (١)ی لە ئابی ٢٠٠٣ دەرچووە.

٣٠- بڵاوکراوەی (لانە):

پاشکۆی گۆڤاری (رابەر)ە بۆ منداڵان.

ساڵی ٢٠٠٣ چەند ژمارەیەکی لێ دەرچووە.

شوێنی دەرچوون/ سلێمانی

٣١- گۆڤاری (کەپر):

شوێنی دەرچوون/ دهۆك

ساڵی دەرچوون/ ٢٠٠٣.

٣٢- گۆڤاری (ئامانج) بۆ زارۆکا:

پاشکۆی گۆڤاری (ئامانج)ی ئێرانییە.

٣٣- گۆڤاری (خاڵخاڵۆکە):

شوێنی دەرچوون/ ئەڵمانیا

کاك (ئەحمەد دەشتی) دەریدەکات.

٣٤- گۆڤاری (مناڵانی باوەگوڕگوڕ):

دەزگای رۆشنبیری (شەفەق) دەریدەکات.

شوێنی دەرچوون/ کەرکووك

سالّی دەرچوون/ ژمارە (١)ی لە کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣دا دەرچووە و تا ئێستاش بەردەوامە.

٣٥- گۆڤاری (زریمۆك):
سەنتەری رۆشنبیریی (بلێ) دەریدەکات.
سالّی دەرچوون/ ژمارە (١)ی لە کانوونی یەکەمی ٢٠٠٤ دەرچووە[1].
جگە لەم چەند گۆڤار و بلاّوکراوانە، ئەم رۆژنامە و گۆڤارانەش سەردەمێك لاپەڕەی منداڵانیان هەبووە: کوردستانی نوێ، برایەتی، گۆڤاری (هەرێم)، گۆڤاری (شارەوانی) گۆڤاری (نوالّەی نوێ) و گۆڤاری (سروە).
ئەمەو ناوە ناوەش بابەتی منداڵانە لە هەندێك لە رۆژنامە و گۆڤارەکاندا بلاّوکراوەتەوە.

**ناوەڕۆکی گۆڤارەکانی منداڵان:**

ناوەڕۆکی گۆڤارەکانی منداڵان چەندین بابەتی منداڵانیان بەخۆیانەوە گرتووە، گرنگەکانیان ئەمانەن:
١- چیرۆك: لە هەموو جۆرە بابەتەکانی دیکە زیاتر لاپەڕەکانی گۆڤارەکانی بەخۆیەوە گرتووە، چیرۆکەکانی منداڵانیش ئەمانە دەگرێتەوە:
- چیرۆکی نووسراو (خۆماڵی).
- چیرۆکی وەرگێڕدراو لە گۆڤارەکانی دیکە.
- چیرۆکی ئامادەکراو لە فۆلکلۆری کوردی.
- زانستە چیرۆك.
- چیرۆك خوێندنەوە بە وێنە.
- چیرۆکی بەسیناریۆ کراو.

٢- شیعر: شیعریش شان بە شانی چیرۆك لە دنیای منداڵ نزیکە و منداڵ بە پەرۆشەوە دەیخوێنێتەوەو زۆرجار لەبەریشی دەکات. سەبارەت بە شیعری منداڵانەوە دەتوانین بلێین کە زۆربەیان شیعری دانراون و شیعری وەرگێڕدراو لە گۆڤارەکاندا کەمن.

٣- بەرهەمی منداڵان: وەکو شیعر و چیرۆك و نیگار... تاد.

٤- بابەتی خافڵاندن و کات بردنە سەر: وەکو (وشەی یەکتر بڕ، وێنە ڕەنگکردن، جیاوازی، زاخاوی مێشك، ڕێگا دۆزینەوە، قسەی نەستەق، پەندی پێشینان، نوکتە و بۆ پێکەنین، بۆشایی پڕکردنەوە، هێڵ بە یەکتر گەیاندن... تاد).

٥- بابەتە هەمەجۆرەکانی دیکە: وەك (پەروەردە، زانست، ئایین، هونەر، وەرزش، ناوداران، شوێنەوارەکان، مێژوو، وێنەی منداڵان... تاد).

**خاڵە دڵخۆشکەرەکان:**

ئەگەر بە وردی بە گۆڤارەکانی منداڵان لەو قۆناغەدا بچینەوە، چەند خاڵێکی دڵخۆشکەرمان بۆ روون دەبێتەوە، لەمانە:

١- هەوڵدانی رۆشنبیر و خەمخۆران بۆ دەرکردنی گۆڤاری منداڵان بە ماوەیەکی کەم دوای راپەڕین و بەردەوامبوون لەم پیشە پیرۆزەدا.

٢- خۆشەویستکردنی زمانی کوردی و خوێندنەوەی کوردی لای منداڵی کورد دوای ساڵانێکی زۆری تامەزرۆیی و بێبەشبوون.

٣- پەیدابوونی کۆمەڵێك نووسەر و رۆژنامەنووس و شاعیر و هونەرمەندی تایبەت بە بواری منداڵان.

٤- ئەو گۆڤارانە رۆڵی دیاریان هەبووە بۆ ئەوەی گەورەکان زیاتر هەست بە گرنگی منداڵ بکەن.

٥- هەندێك لەو گۆڤارانە توانیویانە بەردەوامی بە خۆیان بدەن و مانگانە دەربچن، وەکو: هەنگ، پەپوولە، جگەرگۆشەکان و سڤورە.

٦- زۆربەی بابەتەکان بۆ پەروەردەکردن و ئاراستەکردنی منداڵ بە سوودن.

٧- گۆڤارەکان بە شێوەیەکی گشتی لە رۆشنبیری حزبایەتی و ریکلامکردن بۆ حزب دوورکەوتوونەتەوە، هەرچەندە هەندێکیشیان لە دەزگا حزبییەکانەوە دەرچوونە.

## خاڵە لاوازەکان:

سەرەڕای ئەو خاڵە دڵخۆشکەرانەی کە پێشتر باسمانکردن، چەند خاڵێکی لاوازیش هەستیان پێ دەکرێ، لەمانە:

١- تا ئێستا نەتوانراوە هیچ کام لەم گۆڤارانە بکرێنە هەفتانە یان بەلانی کەمی نیو مانگی و بە رێکوپێکی دەربچێت.

٢- لە زۆربەی گۆڤارەکاندا حیسابی تەمەن نەکراوە[٢].

٣- تیراژی گۆڤارەکان وەکو پێویست نییە و لەگەڵ ژمارەی منداڵانی کوردستان ناگونجێ.

٤- سیستەمێکی رێکی دابەشکردن نییە و گۆڤارەکان وەکو پێویست ناگەنە هەموو جێگایەك، بەتایبەتی ناوچە سەخت و دوورەکان.

٥- نەتوانراوە پردێك لە نێوان منداڵانی هەرێمی کوردستان و پارچەکانی دیکەی کوردستان دروستبکرێت.

٦- هەندێك کەسی ناشیاو خزاونەتە ناو ئەو پیشە پیرۆزەوە، ئەو حاڵەتە زۆر بواری دیکەی جیا لە رۆژنامەنووسی منداڵانیشی گرتووەتەوە.

## گیروگرفتەکان:

ئەگەر پیشەی رۆژنامەنووسی پیشەی (گەڕان بەدوای ناخۆشیدا) بێت و پڕ بێت لە گرفت و تەنگ و چەڵەمە، ئەوە گیروگرفتەکانی رۆژنامەنووسی منداڵان زۆر زیاترە لە گیروگرفتەکانی رۆژنامەنووسی ئاسایی.

### گرنگترین ئەو گیروگرفتانەش ئەمانەن:

١- کەمی ژمارەی بڵاوکراوەکان بە بەراورد لەگەڵ گۆڤار و رۆژنامە گشتییەکان و لەگەڵ ژمارەی منداڵانیش.

٢- کەمی تیراژی گۆڤارەکان.

٣- کەمی ژمارەی نووسەر و شاعیر و هونەرمەندی لێهاتووی بواری منداڵان.

٤- کەمی هۆشیاری زۆربەی خێزانانی کورد سەبارەت بە ڕۆشنبیرکردنی منداڵەکانیان.

٥- گیروگرفتی دارایی.

٦- گیروگرفتەکانی چاپەمەنی و بڵاوکردنەوە و گەیاندن.

٧- گیروگرفتە هونەرییەکان.

## سەرچاوەکان

* لە گۆڤاری (ڕۆژنامەنووس) ژمارە (٢)ی ساڵی ٢٠٠٤ دا بڵاوکراوەتەوە.

(١) ئەم ژمارەیە تەنیا ئەو گۆڤار و بڵاوکراوانە دەگرێتەوە کە هەتا بەهاری ٢٠٠٤ دەرچوونە، دیارە پاش ئەم مێژووەش چەند گۆڤارێکی دیکە دەرچوونە و هەندێکیان تا ئێستاش بەردەوامن.

(٢) گۆڤاری (تاتان) و (کۆلارە) ئەم حیسابەیان کردووە.

# هەواڵ و ئاگاداری و ریکلام لە گۆڤاری (رووناکی)دا*

گۆڤاری (رووناکی) گۆڤارێکی زانستی و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی حەفتانە بووە کە لە ماوەی نێوانی ٢٤ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٥ و ١٦ی مایسی ساڵی ١٩٣٦ لە هەولێر یازدە ژمارەی لێ دەرچووە، هەر ژمارەیەکی شازدە لاپەڕەی قەبارە ٢٨*٢٠ سەنتیمەترە.

دامەزرێنەر و هەڵسووڕێنەری گۆڤارەکە حوسێن حوزنی موکریانی و بەڕێوەبەری لێپرسراوی پارێزەر شیت مستەفا بوو.

ناوەڕۆکی ژمارەکانی گۆڤاری (رووناکی) هەمەجۆرە، لە بابەتی زانستی و کۆمەڵایەتی و مێژوویی و پەروەردەیی و شیعر و سەربوردەی شاعیر و گەروە پیاوان و لێکۆڵینەوە و رەخنە و هەواڵ و ئاگاداری و دەنگوباسی زانستی و ریکلام و... هتد.

ئێمە لەم نووسینەدا سێ لایەنی بابەتەکانی گۆڤاری (رووناکی) دەخەینە بەرچاو، ئەویش هەواڵ و ئاگاداری و ریکلامەکانییەتی. دیارە لاپەڕەکانی گۆڤارێکی حەفتانە[1] لە ساڵانی سییەکاندا باشترین سەرچاوە بوون بۆ گەیاندنی ئەو جۆرە بابەتانە، بەتایبەتی کە هۆیەکانی دیکەی راگەیاندن لەو سەردەمەیدا زۆر کەم و بێ توانا بوون.

ئێستاش با گەشتێك بە نێو لاپەڕەکانی گۆڤارەکەدا بکەین و بزانین چ جۆرە هەواڵ و ئاگاداری و ریکلامیان تێدا بڵاوکراوەتەوە:

### هەواڵەکان:

دەتوانین هەواڵەکانی گۆڤاری (رووناکی) دابەشی سەر سێ بەشی سەرەکی بکەین:

یەکەم: هەواڵە ناوخۆییەکانی تایبەت بە هەولێر.

دووەم: هەواڵەکانی دەرەوەی هەولێر.

سێیەم: هەواڵە جیهانییەکان.

**یەکەم: هەواڵە ناوخۆییەکانی تایبەت بە هەولێر:**

شتێکی ئاساییە کە رۆژنامە و گۆڤارێك زیاتر گرنگی بە هەواڵەکانی ئەو شارە بدات کە تێیدا دەردەچێت، هەر بەم پێیە گۆڤاری (رووناکی)یش زیاتر گرنگی بە هەواڵەکانی شاری هەولێر داوە.

دەتوانین هەواڵەکانی گۆڤاری (رووناکی) لە بارەی پارێزگای هەولێرەوە[٢] بەم جۆرە دابەشبکەین:

**١- هەواڵەکانی حکوومەت:**

گۆڤاری (رووناکی) گرنگی بە هەواڵەکانی حکوومەت داوە، جا ئەو هەواڵانە چ هەواڵی سەردان و هاتوچۆی بەرپرسیاران بن، یان لە بارەی چالاکی دامودەزگاکان سەبارەت بە ئاوەدانکردنەوە و کارە خزمەتگوزارییەکان.

لە بارەی سەردان و هاتوچۆی بەرپرسیاران، گۆڤارەکە ئەم هەواڵانەی بەخۆیەوە گرتووە:

**رۆژی خزمەتی وەتەن لە لیوای هەولێر**

مەبەست لە خزمەتی وەتەن خزمەتی (سەربازی)یە، کە بە پێی یاساکانی عێراقی هەر هاوولاتییەکی ئاسایی دەگرتەوە کە تەمەنی دەبووە هەژدە ساڵ و لە خوێندن بەردەوام نەدەبوو و لە رووی تەندروستیشەوە کەم ئەندام نەبێت.

گۆڤاری (رووناکی) لە ژمارەی سێیەمیدا باسی ئەو دوو کۆبوونەوە رەسمییە دەکات کە لە هەولێر و کۆیەدا بۆ ئەم مەبەستە ئەنجام درابوون.

(رۆژی چوارشەممو[٣] ٣٠ی تشرینی یەك مەئموران و ئەشراف و شورتە و جەیش و گەورەکان لە نادی هەولێر کۆبوونەوە، کەشافەی مەکتەب و شاگردەکانی لەلایەکەوە

بە شەوقی (شەرقی نووسراوە ح.ف.) وەتەنی گوتن راوەستان و ئیرادەی مەلەکی بۆ فەحسی نیهایی خوێندرایەوە، سەعادەتی موتەسەڕیفی غەیوور ئەحمەد بەگ بۆ خزمەتی عیلم و عیرفان و بەخێوکردنی وەتەن و بوونە جوندی خوتبەیەکی گەلێك بەرز و بە مەعنای خوێندەوە، ئەو رۆژە بۆ هەولێر رۆژێکی زۆر گەورە و میهرەگیان و جەژنێکی زل و خۆشەویست بوو)[٤].

## کۆی سنجاق

(رۆژی پێنشەممە ٣١ی تشرینی یەکەم سەعادەتی موتەسەڕیفی خۆشەویستمان بۆ ئیشتراکی جەژنی وەتەن تەشریفیان چوونە کۆی و لە ژێر چاودێرییاندا ئیرادەی مەلەکی دائیر بە فەحسی نیهایی خوێندرایەوە، لەلایەن بەعزێ ئەشخاسەوەش خوتبە خوێنراو نوقق درا)[٥].

گۆڤاری (رووناکی) لە ژمارە چواریدا باسی سەردانی وەزیری ناوخۆ خوالێخۆشبوو رەشید عالی گەیلانی دەکات بۆ هەولێر و ئەو پێشوازییە گەرمەی کە بۆی کراوە، لەگەڵ ئەو هیواو ئاواتانەی کە میللەتی کورد بە وەزارەتەکەی هەیە و ئەو پێوەندییە گیانییەی کە لە نێوان کورد و بنەماڵەی گەیلانیدا هەیە.

## تەشریف هێنانی وەزیری داخلییە بۆ هەولێر

(رۆژی شەممو ١٤ی مانگی ئێستا سەعات یازدەی زەوالی سەعادەتی موتەسەڕیفی لیواو روئەسای دەوائیر و ئەشراف و عولەما و مەشایەخی شار و روئەسای عەشایری لیوا لە مەرکەزی لیواوە بۆ پێشوازی فەخامەتی وەزیر رەشید عالی بەگ گەیلانی بۆ پردێ کە مونتەهای لیواکەمانە حەرەکەتیان فەرموو، سەعات دوازدە و نیوی زەوالی فەخامەتمەئابیان لە کەرکووکەوە مواسەڵەتی پردێیان کرد، زەواتی مەحتەرەمینی موستەقبیلین بە کەمالی سروور و فەرەحەوە مەراسیمی پێشوازیان بەجێ هێنا، لەبەر ئەوەی کە عموومی ئەهالی لیواکەمان ئومێدێکی زۆر قەوییان بە وەزارەتی حازرە

هەیە کە بۆ تەرەقی مەعاریف و علوم و ئیقتیسادیات و ئیحتیاجات و ئاوەدانی کردنەوەی مەملەکەتەکەمان بۆ ئاوهێنان و پێشخستنی تیجارەت و زەراعەت لوتف بفەرموون، چونکە ئەو وەزارەتە موحتەرەمە موتەشەکیلە لە چوار زاتی باریزەی دەوڵەت کە فەخامەتمەئابانی یاسین پاشا هاشمی و نووری پاشا سەعید و جەعفەر پاشا عەسکەری و رەشید عالی بەگ گەیلانین کە هەر چواریان بە رەئیسولوەزارەتی خزمەتی حکوومەت و میللەتیان بە نییەتێکی خاوێنەوە بەجێهێناوە، بەتایبەتی فەخامەتی رەشید عالی بەگ لە ئەجدادیەوە رابیتەیەکی کولیەی لە کوردستان دایە، لە مەرحوم شێخ عەبدولعەزیزی ئاکردەوە خزمەتی ئەم میللەتە نەجیبەیان کردووە.

میللەتی کورد پتر مەربووتییەتی رووحانییان بە عایلەی موقەدەسی گەیلانی وەیە، هەروەکو میللەتی کورد پتر مەربووتییەتیان بەو عایلەوەیە و فەخامەتی رەشید عالی بەگ گەیلانی کە لەم سولالە پاکەیە ئومێدەوارترن کە بە سووننەتی ئابائو ئەجدادی خۆیان بە دڵێکی خاوێنەوە بۆ بەجێهێنانی ئیحتیاجیات و پێویستی دانیشتووانی ئەم وەتەنە خۆشەویستە کە کوردن هیمەت و جوهد بفەرمووێت، بەو ئومێدە عموومی ئەهالی هەولێر بە ئەسنافی موختەلیفەوە دەستە بە دەستە لە شاردا بۆ پێشوازی فەخامەت مەئابیان ئامادە و بە کەمالی سروورەوە چاوەنۆڕ بوون.

کەشافەی مەکتەب لە خاریجی شارەوە بەرێز بۆ رەسمی بەخێرهاتن بە نەشید خوێندنەوە و کەیف و سروور رێز ببوون، لە تەرەف ئامیری حامییەوە حەرەسی شەرەف لەبەر دەرگای سەرادا راگیرابوون.

فەخامەتی وەزیر و زەواتی موحتەرەمینی موستەقبیلین لە پردێوە روو لە هەولێر حەرەکەتیان فەرموو و بە کەیف و شادمانی و سروورەوە گەیشتنە شار، تەڵەبەی مەکتەب و کەشافە رەسمی بەخێرهاتنیان بەجێهێنا.

فەخامەتی وەزیر بە ئەحوال پرسینی تەڵەبە و ئەهالی روو بەسەرا چوون، لە هەموو لایێکەوە ئەهالی بەدەنگی هەر بژی وەزارەتی حازرە و فەخامەتی وەزیر کەیفیان کرد، لە پاش گەیشتنی فەخامەتی وەزیر بۆ سەرا عموومی عولەماو

مەشایەخ و ئەشراف و ڕوئەسای عەشایر بەدەستە چوونە لای فەخامەتی وەزیر و عەرزی بەخێرهاتن و ئیزهاری ئیخلاسمەندییان بۆ وەزارەتی حازرە کرد و گەڕانەوە، لەبەر ئەوە کە موتەسەڕیفی لیوا ئیحتیاجیاتی میللەت لە هەموو کەس چاکتر دەزانن و لە هەموو شئوونێکا مەسئوولە و چاکە و خراپەی وەتەن و میللەت لەو دەناسرێ و هەموو مەسائیلێکی لیوامان لە عومدەی ئەو دایە، ئومێدمان وایە بە ویجدانی خاوێن و نییەتێکی پاکەوە فەریزەی زیمەتی بەجێهێنابێ و فەخامەتی وەزیری لە هەموو ئیحتیاجاتێکان ئاگادارکردبێ و پێی گوتبێ، شەوێ لە قەسری موتەسەڕیف بوون سبەینە ڕۆژی یەك شەممە سەعات نۆی زەوالی پێش نیوەڕۆ هەموو ئەشراف و موحتەرەمانی شار و ڕوئەسای عەشایرەکان بۆ بەڕێ کردنی فەخامەتی وەزیر هەتا گوێڕ بە بزۆك چوون، عەشایەر و ڕوئەسای قەزای مەخموور بە دەستوورێکی موحتەشەم بە سواری لە خاریجی مەرکەزی ناحیەی گوێڕ بۆ پێشوازی هەتا سەر (زێ) ڕێزیان بەستبوو، فەخامەتی وەزیریان بە کەمالی سروورەوە بەڕێ کرد هەتا بە لیوای موسڵیان گەیاند)[٦].

لە بارەی ئاوەدانکردنەوە و چالاکی دەزگاکانی حکوومەتیش، گۆڤاری (ڕووناکی) چوار هەواڵی بڵاوکردووەتەوە، هەواڵی یەکەم سەبارەت بە قیرتاوکردنی ڕێگاوبانە لەلایەن دائیرەی ئەشغالەوە کە دەڵێ:

(دائیرەی ئەشغالی لیواکەمان بۆ قیرەتاو و ڕێکخستنی ڕێگاو بان تێدەکۆشێ و لە هەموو لایێکەوە خەریکە ئەگەرچی ڕێگای نێوان قوشتەپە و پردێ لەباران و تەڕو تووشیدا ڕێبوار تووشی ماندووبوون و کەمێك ناخۆشی و ئەزیەتیش بهاتانایە بەڵام بە هیمەتی مولاحیزی ئەشغال و غیرەت کەشی موهەندیسەکان چاك کراوە و شەو و ڕۆژ لەبن چاوەدێرییان دایە بۆ پاك کردنەوەی تەقەڵا دەدرێ ڕێبوار بەبێ ئەزیەت دێن و دەچن)[٧].

هەواڵێکی دیکەی گۆڤاری (ڕووناکی) لە بارەی گەیاندنی ئاوە بۆ دەشتی قەراج، هەرچەندە لە گۆڤارەکەدا (دەشتی قەرەچووخ) نووسراوە، بەڵام دیارە قەرەچووخ دەشت نییە و چیایە، دەشتی قەراجیش لە پشت چیای قەرەچووخەوە دەستپێدەکات:

## دەشتی قەرەچووخ

(هەروەکو لە هێندێك جێگایانمان زانیوە لە زێوە ئاو بۆ قەرەچووخ و ئەو خاکە پڕ پیزە و حاسیلات خیزە ئاودێری کردنی لە دەست دایە.

جۆگەیەکی گەورە لە زێوە هەڵدەگیرێ دەبرێتە دەشتی قەرچووخ ئەو خاکە هەموو دەکرێتە ئاوی.

خودا بکات وابێ و دەشتی هەولێر و خوارەوەشی بە ئاوی هەردوو زێ ئاوەدان و بخرێتە رێزی ئەو خاکانە کە لە جۆمە گەورەکان ئیستیفادەیان کردووە و جۆمێکیان بۆ هەڵبەستراوە)(٨).

سێیەمین هەواڵی گۆڤاری (رووناکی) سەبارەت بە چالاکیی دامودەزگاکانی حکوومەت، هەڵکەندنی بیرێکی ئیرتیوازییە لە شاری هەولێر:

(ئەمە چەندێکە موهەندیسی بەتایبەتی خاکناس لەلایەن ئەشغالەوە ناردراوەتە هەولێر لە شەرقی شیمالی قەڵای هەولێر چالاوێکی سەد و سی فووت قووڵی هەڵقەندووە و گەیشتۆتە ئاوێکی باش. وەکو بیستوومانە ئەگەر تورمپایەکی گەورەی هەبوایە ئەم چاڵاوە لە موددەتی بیست و چوار سەعاتدا شەش سەد هەزار گالۆن ئاوی دەدا، بەڵام ئەمڕۆکە لە سەد و پەنجا کەمتر ئاو نادات و ئێستاش خەریکی هەڵقەندنی چالاوێکی دیکەن نزیك هەشتا فووتیان هەڵقەندووە. لە جێگایانی باوەڕ پێکراومان زانیوە کە چوار چاڵاوی وا هەڵدەقەندرێ تاکو شارەکەمان لە ترسی بێ ئاوی رزگار بێ و بۆ هەفتەی داهاتوو لەلایەن پیاوە گەورەکانی حکوومەتەوە رەسمی گوشادی ئەم چاڵاوە دەکرێتەوە و گەلێك گەورە پیاوان ئیشتراکی ئەم رەسمی گوشادە دەکەن. لەم مەسئەلەیەدا شوکران و سوپاسی ئەو گەورە پیاوەی دەکەین کە بۆ مەسئەلەی ئاو کۆششی فەرمووە)(٩).

دوا هەواڵی ئاوەدانکردنەوە لە گۆڤاری (رووناکی)دا هەواڵی دروستکردنی شەست و چوار دووکان و چایخانەیەك و چوار سەکۆیە بە بڕی (٤٧٥) دینار. هەواڵەکە دەڵێ:

(لەلایەن سەید هادی مەئمووری ئەوقافی کۆی شێست و چوار دووکان و چایخانەییێك و چوار سەکۆ لەسەر دەستووری تازە بە چوارسەد و حەفتا و پێنج دینار پێکهێنراوە. لە مانگی رەمەزانی ساڵی (١٣٥٤) هیجریدا کۆتایی هاتووە... هتد)[١٠].

## ٢- هەواڵی وەرزشی:

گۆڤاری (رووناکی) لە ژمارەی دووەمیدا هەواڵێکی وەرزشی بڵاوکردووەتەوە، هەواڵەکە ئەوە دەسەلمێنێ کە هەولێر هەر لە کۆنەوە گرنگیی بە وەرزش داوە و دەولەمەندەکانیشی هاندەرێکی باشی وەرزش بووینە.

## کاسی ئەحمەد چەلەبی دەباغ

(ئەحمەد چەلەبی دەباغ بۆ موسابەقەی حەرەکاتی ریازییە و تەشجیعی رۆحی ریازییە لە زیو کاسێکی دروستکردووە. ئەم کۆشەوەی ئەحمەد چەلەبی سوپاسدەکرێ و شایانی منەتداری و شوکرانەیە ئومێد دەکەێن گەورەکانی هەولێر هەرییێك بە روحێکی موقەددەس و خاوێنەوە پێشوازیی ئەو جۆرە مەشرووعانە بفەرموون و هەر یەك لەگەڵ مەشروعێکی نیشتمانەکەیاند خەریك بن زۆر پێ ناچێت خاکە پیرۆزەکەمان گەلێك سەردەکەوێت و روو لە عیمران دەکات)[١١].

مرۆڤ کە لە خوێندنەوەی ئەم هەواڵە دەبێتەوە دەبینێ چۆن بەرپرسانی گۆڤارەکە هەواڵی دروستکردنی کاسەکەیان قۆزتووەتەوە بۆ ئەوەی هانی دەولەمەندەکانی شار بدەن کە هەر یەکەیان لەگەڵ پرۆژەیەکی نیشتمانەکەیاندا خەریك بێت بۆ ئەوەی بە ماوەیەکی کەم شار پێش بکەوێت و ئاوەدان بکرێتەوە و بچێتە ریزی شارە بەناوبانگەکان.

### ٣- هەواڵی گەڕانەوەی حاجییان:

یەکێك لە نەریتە کۆنەکانی شاری هەولێر ئەوەبوو کاتێك کە حاجی بە سەلامەتی لە سەفەری حەج دەگەڕانەوە، خەڵك بەخۆشی و بەزم و دەف لێدان و سەڵاوات لێدانەوە پێشوازییان لێ دەکردن و هەتا ماڵی حاجییەکە لەگەڵ کەژاوەکەیدا دەچوون.

گۆڤاری (رووناکی) بەم جۆرە باسی گەڕانەوەی حاجییان دەکات: (لە ئەهالی لیوامان چەند کەسێك کە چووبوونە تەوافی بیت الله الحرام زاده الله الشرف دەستەیەکیان بە سەلامەتی گەیشتنەوە هەولێر.

ئەهالی بەدەف و دائیرە بە شەرەف و ئیحتیرام پێشوازییان کردن بە شادمانی و کەیف و سروور گەیاندیاننەوە ماڵی خۆیان. خودا حەجیان قبوول کاو لە نێو ماڵ و منداڵیاندا بە خۆشی رایبوێرن و حاجییەکانی لە رێگادان بە ساغی و سەلامەتی بیانگەیێننەوە ماڵی خۆیان)(١٢).

### ٤- هەواڵی کۆچی دوایی ناودارێکی هەولێر:

### زایعاتێکی گەورە لە هەولێر

(لە گەورە ئەشراف و سەرهاتی مەملەکەتەکەمان حاجی سەعید ئاغا کوڕی تەها ئاغای گەورە لە ئێوارەی شەممە بە یەزدانی خودا شادبوو بەڕاستی جێگای ئەسەف و عاجزیە، خودا سەبووری و شەکیبای بدا بە براو برازاو خزم و کەس و کارو عیلە و ئەولادی مەرحووم. ئێمە بە دڵێکی پڕ غەمەوە ئیشتراکی حوزن و ماتەمی کەس و کاری مەرحووم دەکەین)(١٣).

### دووەم/ هەواڵەکانی دەرەوەی هەولێر:

سەبارەت بە هەواڵەکانی دەرەوەی هەولێر لە گۆڤاری (رووناکی)دا دوو جۆرە هەواڵ بەرچاو دەکەون:

١- هەواڵی کردنەوەی یانەی سەلاحەددین لە بەغدا.

٢- هەواڵی چاپەمەنییەکان.

لە بارەی کردنەوەی یانەی سەلاحەددین لە بەغدا، گۆڤارەکە بەم جۆرە رایدەگەیەنێ:

**یانەی سەلاحەدین لە بەغدا دەکرێتەوە**

(لەلایەن گەورە و ناودارەکانی کوردەکانەوە لە بەغدا بۆ کردنەوەی یانەی سەلاحەدین تەقەلا دراو نیزامی ئەساسی ئەو یانەیە لەگەڵ مەزبەتەیێك کە بە ئیمزای نۆ نائیب و ئەعیانێکەوە رۆژی شەممە هەشتی شوبات تەقدیم بە وەزارەتی داخلیەی جەلیلە کراو لەم رۆژانەدا وام زانیوە کە کردنەوەی یانە لەلایەن وەزارەتەوە پەسند فەرمووراوە.

ئەعیان ئەحمەد عوسمان بەگ، نایبی کەرکووك: دارا بەگ، شێخ فائیق تالەبانی، داود بەگی جاف، نایبی هەولێر مەلا حەوێز ئاغا، میرانی قادر بەگ، حسێن ئاغا مەلا، نایبی سلێمانی حامید بەگ جاف، عەلی کەمال بەگ.

ئەو کوردە موحتەرەمانە ئیمزایان کردووە بەهۆی ئەوان و چەند گەورەیێکی کوردەوە تەقدیم کرا ئومێد ئەکەین بەتایبەتی کورد و بە عموومی هەموو عێراقییێك لەو یانەیە سوودمەند بن و پایەی یێکەمین بی خۆشەویستی و یێکەتی لە نێوان برا عێراقییەکاندا.

هەرچەندە بەڕاستی گەورەکان بۆ ئەو کارە بەخێرە زۆر ماندوو بوون و تەقەلایاندا. هەتا هاتە وجوود بەلام وا ئومێد ئەکرێ ئەو گەورە کوردانە لە رووی دامەزراندنی یانە پتر تێبکۆشن بۆ سەرکەوتن و پێشخستنی ئەو یانەیە و لێی سارد نەبنەوە و هەروەکو لە سەرەتادا بە گەرمەوە پەلەیان کرد بۆ دامەزراندنی لە کردنەوەشیدا پتر هیمەت بفەرموون بۆ پایەداری و راوەستان و بەردەوامیی ئەو یانە پیرۆزە کەوا لەرێیدا خۆیان ماندوو کرد و پارەیان تێیدا بەخت فەرموو لە بەغداوە)[١٤].

سەبارەت بە هەواڵە چاپەمەنییەکانیش گۆڤاری (ڕووناکی) لە ژمارە (١، ٢، ٧)دا چەند هەواڵێکی ڕاگەیاندووە تێیاندا باسی ئەو کتێبانە دەکات کە لەم سەردەمەیدا دەرچووینە، کتێبەکانیش ئەمانەن:

### کوردستان

(لەلایەن موعەلیمی تەئریخ و جوغرافیای دەورەی دووەمی مەدرەسەی متوەسیتەی شوعبەی ئەدەبی مەداریسەکانی خاکی ئێران عەلی ئەسغەر شەمیم هەمەدانییەوە بە فارسی کتێبێکی بەناوی کوردستانەوە لە تەورێزەوە چاپکراوە)[١٥].

### ئومەڕای سۆران

(لەلایەن حوسێن حوزنی موکریانی خاوەنی چاپخانەی زاری کرمانجییەوە کتێبێك بەناوی (میرانی سۆران)ەوە چاپکراوە. بە کورتی دێرێکی (ئومەڕایانی کوردی سۆران)ە نزیك سەدو بیست لاپەڕەیەکە کتێبێکی گەلێك سوودمەندە)[١٦].

### مەتبوعاتی تازە

(لە چاپخانەی زاری کرمانجی ڕەواندز بە کورتی تەئریخی (دێرێك) میرانی سۆران چاپکراوە تەئلیفی دێرێك نویس حوسێن حوزنی دانەیەکی بە سی فلووسە)[١٧].

(لە تەلەبەی حقووقی بەغدا لاوێکی کوردی بە کۆشەوەو غەیوور جەنابی شاکر فەتاح کتێبێکی بە کوردی بۆ شاگردانی مەکتەبی ئیبتدائی تەئلیف کردووە وەکو دبێژرێ چاپکراوە)[١٨].

(موعەلیم مەدرەسەی کۆیی جەنابی سەعید فەهیم (ئەلف و با)یێکی بە کوردی تەئلیف کردبوو وابزانم بۆ چاپ و نەشری موافەقەتکراوە و لە چاپدراوە)[١٩].

## مەتبووعاتی تازەی کوردی

(لەلایەن جەنابی رەفیق حیلمی بەگ مامۆستای مەکتەبی موتەوەسیتەی بەغداوە کتێبێکی حیسابی لەسەر نەفەقەی خۆی چاپکردووە. بۆ شاگردانی رێزی پێنجەم و شەشەم گەلێك باش و سوودمەندە ئومێد ئەکەین بە هەوەس و خۆشی زۆر بیکڕن تاك و یەك دوو تەئلیفاتی دیکەش بەدەستەوەیە زوو بیخاتە چاپەوە)[٢٠].

(جەنابی فازیل و عالم مەلا محەمەد قزلجی کتێبێکی (چل فەرموودەی پێغەمبەر)ی بە کوردی لە چاپ داوە گەلێك باشەو بە کەلکە پڕ لە پەند و قسەی چاکە)[٢١].

## سێیەم/ هەواڵی جیهانی:

لە هەواڵە جیهانییە گرنگەکانی ئەو کاتی کە گۆڤاری (رووناکی) گرنگی پێداوە و بڵاوی کردووەتەوە، هەواڵێکی زانستییە لە بارەی (نۆرماندی) گەورەترین کەشتی جیهان:

## گەورەترین کەشتی (پاپۆڕ)ی جیهان نۆرماندی

(لە حکوومەتی فەرەنسە کەشتییێکی زۆر گەورە بەناوی (نۆرماندی) تازە دروستکراوە)

ئەو پاپۆڕە لە هاڤیر هەتا نیویۆرك بە چوار رۆژ و سێ سەعات چووە. لە پێش کەوتندا رەقەم قیاسی کەشتی (ببریمان) کە بێکەم پاپۆڕی ناوداری ئەڵمان بوو لە ساڵی ١٩٢٩دا لە هاڤیرەوە بۆ نیویۆرك بە چوار رۆژ و حەڤدە سەعات چوو بوو...)[٢٢].

## ئاگادارییەکان:

گۆڤاری (رووناکی) وەکو تاکە کەناڵێکی ئەوسای راگەیاندن لە هەولێر چەند ئاگادارییەکیشی تێدا بڵاوکراوەتەوە، ئاگادارییەکان هەندێکیان تایبەتن بە دەزگاکانی حکوومەت و هەندێکیشیان تایبەتن بە گۆڤارەکە خۆی، ئاگادارییەکیش سەبارەت بە فرۆشتنی بەشێکی زەوی و زاری گوندێکە لە پایزگای هەولێر.

ئاگادارییەکانی حکوومەتیش هەندێکیان بە کوردین و هەندێکیشیان بە تورکی و عەرەبین.

ئاگادارییەکانی تایبەت بە حکوومەت بە زمانی کوردی ئەمانەن:

(رەسم ئی قەسەب و حسرانی قەزای ئەربیل قرار درابوو بۆ ئەمانەتەن ئیدارە بکرێ بینا لەبەر زهووری تالیب بە قەراری مەجلیسی ئیدارەی لیوا ژمارە ١٧٤ و رۆژ ١٩٣٦/٤/٨ ئیعتیبار بە تەئریخی ئەم ئیعلانەوە ١٠ رۆژ موددەی موزایەدە تەعیین کراوە ئەوانەی کە تابیعی ئیلتیزامی ئەم رسوومانەیە بە ئەمیناتی نیزامییەوە بۆ مەجلیسی ئیدارەی لیوا وەیا موحاسبەی لیوا لزوومی موراجەعەتیان ئیعلان ئەکرێ[٢٣].

(لەبەر ئەمەکە بۆ وئیلێزامی مەعبەری تەق تەق تالیب دەرچووەو بە ٦٠ دینارمۆرکراوە لە ئیعتیبار ١٩٣٦/٤/٢٧ دە رۆژ موددەی موزایەدە تەعیین کرا. ئەوانە کە تابعی مەعبەری مەزکوور بەئەمیناتی نیزامییەوە بۆ مەبۆ مەجلیسی ئیدارەی قەزای مەزکوور وەیا لیوا لزوومی موراجەعەتییان ئیعلان کرا[٢٤].

سەبارەت بە فرۆشتنی سێیەکی گوندی (سارەلوو)ش گۆڤارەکە ئەم ئاگادارییەی بڵاوکردووەتەوە:

(سێیەکی هەموو گوندی (سارەلوو) کە داخیلی لیوای هەولێرە نزیک سەد تەنعار بنەتۆ ئەرزای چانندنی هەیە دەفرۆشێ هەرکەسی موشتەرییە و دەیەوی سێیەکە بەشی ئەو گوندە بکڕێ لە هەولێر لە مەتبەعەی رازی کرمانجی موراجەعەی خەلیل ئیبراهم بکات)[٢٥]

گۆڤاری (روناکی) دوو ئاگاداریی تایبەت بەخۆیشی بڵاو کردووەتەوە، یەکێکیان لەبارەی هۆی پاشکەوتنی دەرچوونی گۆڤارەکە و ئەوی دیکەش سەبارەت بە ئابوونەی ساڵانەی گۆڤارەکەیە:

### ڕووناکی

(لەبەر ئەوە ئەسباب و جێگای مەتبەعەکەمان پێك نەهێنرابوو مجەللەی ڕووناکی لە دەرکەوتن پاش کەوتبوو لەم ڕۆژانەدا پێویستی مەتبەعە و جێگا ڕێکخراو حەرف چنین (مرتب)ی زۆر چاك کوستاخمان بۆ هاتووە.

ئومێد ئەکەین لەمە بەولاوە هەموو ڕۆژێ لە مەوسیمی خۆیدا دەرچێ و چاکتر و جوان و مەرغووب بێ؟)[٢٦].

### پاڕانەوە و تکا و خواهیشت

(لەبەر ئەوە کە ئەم مجەللە جگە لە دراوی موشتەریکە موحتەرەمەکان چی ڕێگاییێکی دیکەی نییە بۆ خۆ ژیاندن بەتایبەتی لەبەر موشتەریکە خۆشەویستەکان دەپاڕێینەوە بۆ ئەمە کە ئەم مجەللە ئیدارە بکرێ و نەکەوی بە دەلی ئیشتراکی سالانەمان پێ لوتف بفەرموون؟)[٢٧].

ئەمەو گۆڤارەکە دوو ئاگاداری بە زمانی تورکی و ئاگادارییەکیشی بە زمانی عەربی بلاوکردووەتەوە، ئاگادارییە عەرەبییەکە و ئاگادارییەی تورکی لە سێ ژمارەدا بلاوکراونەتەوە، ئەویش ژمارە (٤ و ٥ و ٦)ە، ئاگادارییە تورکییەکەی دیکەش لە ژمارە (١٠)ی ڕۆژی ٢٥ی نیسانی ١٩٣٦دا بلاوکراوەتەوە.

### ریکلام:

گۆڤاری (ڕووناکی) ریکلامی بۆ دوو شت کردووە، هەردوو شتەکەش تایبەتن بە گۆڤارەکە و کارمەندانی و چاپخانەکەیەوە، ئەمەش شتێکی ئاساییە و بە هیچ شێوەیەك نابێتە جێگەی سەرسوڕمان.. ریکلامی یەکەم بۆ چاپخانەی (زاری کرمانجی) و هی دووەمیش بۆ نووسینگەی پارێزەر (شیت مستەفا)ی بەڕێوەبەری لێپرسراوی گۆڤارەکەیە، هەردووکیش لە ژمارە (٧)ەوە دەستیپێکردووە و لە هەموو ژمارەکانی دواتریش دووپات کراونەتەوە.

لە ژمارە (٧)دا بەم جۆرە باسی چاپخانەی (زاری کرمانجی) کراوە:

(مەتبەعەی زاری کرمانجی هەولێر بۆ تەبعی هەموو مەتبوعاتێك ئامادەیە).

بۆ پارێزەر شیت مستەفاش دەڵێ:

(ئوستاذ شیت ئەفەندی مستەفا موحامییێکی ماهیر و قانوون شناسە مەحەللی لە هەولێر نزیك سەرای حکوومەتە تەماشای هەموو دەعواییێك دەکات هەر کەسێ چ جۆرە دەعواییێکی هەبێ موڕاجەعەت بەو ئوستادە فازیلە بفەرمووێ).

بەڵام لە ژمارە (٨ و ٩ و ١٠ و ١١)دا هەردوو ریکلامەکە بەم جۆرەن:

(چاپی زاری کرمانجی هەولێر

بۆ چاپ کردنی هەموو نووسراوێك ئامادەیە).

(موحامی شیت مستەفا

تەماشای هەموو دەعواییێك دەکا مەحەللی لە نزیك سەرای حکوومەتە).

## پەراوێزەكان

* لە ژمارە (١)ی گۆڤاری (رۆژنامەڤانی)دا بلاوكراوەتەوە، كە لە ٢٢ی نیسانی ساڵی ٢٠٠٠دا دەرچووە.

(١) هەرچەندە هەندێكجار ماوەی دەرچوونی نێوان هەر ژمارەیەك و ژمارەی دواتری لە هەفتەیەك زیاتر بووە، بەلاّم نزیكەی نیوەی ژمارەكانی هەفتانە بە رێكوپێكی دەرچووە.

(٢) جاران هەولێر لیوا بوو، دوای دەرچوونی یاسای پارێزگاكان هەموو لیواكانی عێراق بوونە پارێزگا.

(٣) دەقەكانی بێ دەستكاری بەلاّم بە رێنووسی ئێستای كوردی دەنووسینەوە ئەویش بۆ ئاسانتركردنی خوێندنەوەیەتی بۆ خوێنەری ئێستا.

(٤) گۆڤاری (رووناكی)، ژمارە (٣)، ٢٩ی تشرینی دووەم ١٩٣٥، ل١٣.

(٥) گۆڤاری (رووناكی)، ژمارە (٣)، ل١٣.

(٦) هەمان سەرچاوە، ژمارە (٤)، ل١٥ و ١٦.

(٧) هەمان سەرچاوە، ژمارە (٨)، ل١٤.

(٨) هەمان سەرچاوە، ژمارە (٨)، ل١٦.

(٩) هەمان سەرچاوە، ژمارە (٨)، ل١٦.

(١٠) هەمان سەرچاوە، ژمارە (١٠)، ل١١.

(١١) هەمان سەرچاوە، ژمارە (٢)، ل١٢.

(١٢) هەمان سەرچاوە، ژمارە (٧)، ل١٦.

(١٣) هەمان سەرچاوە، ژمارە (٧)، ل١٥.

(١٤) هەمان سەرچاوە، ژمارە (٧)، ل٣و٤.

(١٥) هەمان سەرچاوە، ژمارە (١)، ل٩.

(١٦) هەمان سەرچاوە، ژمارە (١)، ل١٤.

(١٧) هەمان سەرچاوە، ژمارە (٢)، ل٥.

(١٨) هەمان سەرچاوە و ژمارە و لاپەڕە.

(١٩) هەمان سەرچاوە و ژمارە و لاپەڕە.

(٢٠) هەمان سەرچاوە، ژمارە (٧)، ل١٦.

(٢١) هەمان سەرچاوە و ژمارە و لاپەڕە.

(٢٢) هەمان سەرچاوە، ژمارە (٩)، ل٦.

(٢٣) هەمان سەرچاوە، ژمارە (١٠)، ل١٦.

(٢٤) هەمان سەرچاوە، ژمارە (١١)، ل١٠.

(٢٥) هەمان سەرچاوە، ژمارە (٧)، ل١٦.

(٢٦) هەمان سەرچاوە و ژمارە و لاپەڕە.

(٢٧) هەمان سەرچاوە، ژمارە (١٠)، ل١٥.

# هەواڵ و ئاگادارییە پەروەردەییەکانی ساڵانی ١٩٢٠-١٩٢٦ لە رۆژنامەنووسیی کوردیدا*

هەڵدانەوەی لاپەڕە پرشنگدارەکانی رۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان زۆر لایەنی سیاسی و ئەدەبی و کۆمەڵایەتی و مێژوویی و پەروەردەیی و کەلتووریی کوردستانمان بۆ روون دەکاتەوە.

هەرچەندە پرۆسەی پەروەردە لە سەرەتاو ناوەڕاستی سەدەی رابردوودا ئەو پێشکەوتنەی بەخۆیەوە نەبینیبوو کە لە نیوەی دووەمی سەدەکەدا بەخۆیەوە بینی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا رۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەوکاتی چەندین هەواڵی پەروەردەییان بەخۆیانەوە گرتووە.

کە لە هەواڵ و ئاگادارییە پەروەردەییەکانی ئەو سەردەمەیدا ورد دەبینەوە چەند راستییەکمان بۆ روون دەبێتەوە، وەکو:

١- هەواڵ و ئاگادارییەکان هەموویان بە زمانی کوردی نووسراون، بەڵام بەو کوردییەی کە خەڵکی رۆشنبیری ئەوسا قسەیان پێدەکرد.

٢- زۆربەی هەواڵەکان لە بارەی کردنەوەی قوتابخانە و ناونووسکردنی قوتابیان و دامەزراندنی بەڕێوەبەر و مامۆستا و کۆکردنەوەی پارە بۆ کاروباری قوتابخانەکان و چەند چالاکییەکی دیکەی پەروەردەیین.

٣- هەواڵەکان زۆربەی هەرە زۆریان لە باری شاری سلێمانییەوەن، ناو بە ناویش هەواڵی پەروەردەیی شوێنەکانی دیکەش بەرچاو دەکەون.

٤- شاری سلێمانی تا ساڵی خوێندنی ١٩٢٠-١٩٢١ تەنیا یەك قوتابخانەی هەبووە، ئەویش بە ناوی (مەکتەبی نموونەیی سەعادەت) بووە، لەو ساڵەوە قوتابخانەیەکی دیکە لە گەڕەکی (دەرگەزێن) بەناوی (مەکتەبی عیرفان) کراوەتەوە.

٥- سەرەتای بیستەکان شاری سلێمانی لەم گەڕەکانە پێکهاتبوو: (گۆیژە، کانی ئاسکان، دەرگەزێن، سەرشەقام، جوولەکان و چوارباخ).

٦- لە ساڵی ١٩٢٢دا لە شاری سلێمانی قوتابخانەی شەو هەبووە.

٧- هەروەکو لە ئاگادارییەکاندا دەردەکەوێ کە (خانەی مامۆستایان) بۆ یەکەمجار لە بەغدا لە ساڵی خوێندنی ١٩٢٠-١٩٢١دا کراوەتەوە.

٨- دامەزراندنی مامۆستا و بەڕێوەبەرەکان لەسەردەمی حکوومەتی کوردستاندا بە دەستنیشانکردنی (زانیاری- معارف)بووە و ئیرادەی مەلەکیشی بۆ دەرچووە کە لەلایەن شێخ مەحموودی مەلیکی کوردستانەوە ئیمزا کراوە.

٩- سەردان و هاتوچۆ و گواستنەوەی مامۆستایان بایەخێکی تەواوی پێدراوە و لە رۆژنامەکاندا بڵاوکراوەتەوە.

١٠- لە سەردەمی دەرچوونی ئەو رۆژنامانەدا سلێمانی لە رووی پەروەردەییەوە سەر بە بەڕێوەبەرایەتی زانیاریی کەرکووك بووە و لە ساڵی ١٩٢٥دا بۆ یەکەمجار ئەنجوومەنی زانیاری لە شاری سلێمانی دامەزراوە.

١١-قوتابخانەی ئامادەیی لە سلێمانی لە ساڵی خوێندنی ١٩٢١-١٩٢٢دا کراوەتەوە.

١٢- لەسەرەتای ساڵی خوێندنی ١٩٢١-١٩٢٢دا قوتابخانەی پیشەسازی لە شاری کەرکووکدا کراوەتەوە.

١٣- لە رووی زمانەوانییەوە هەندێك وشەی وا لە رۆژنامەکاندا بەکارهاتوون کە تایبەتن بە ناوچەی سلێمانی، وەکو: (هەنگێ) لەجیاتی (هەندێ)... هەندێك جاریش وشەی وا نووسراوە کە لە سلێمانیدا بە شێوەیەکی دیکە دەگوترێ، وەکو: (دەکرێتەوە) لەجیاتی (ئەکرێتەوە)...هتد.

سەرچاوەی ئەم هەواڵ و ئاگادارییە پەروەردەییانەی کە لێرە نووسراون، سێ رۆژنامەی شاری سلێمانین کە لە ساڵانی ١٩٢٠-١٩٢٦دا دەرچووینە. رۆژنامەکانیش ئەمانەن:

١- رۆژنامەی (پێشکەوتن) ١٩٢٠-١٩٢٢.

٢- رۆژنامەی (ئومێدی ئیستقلال) ١٩٢٣-١٩٢٤.

٣- رۆژنامەی (ژیانەوە) ١٩٢٤-١٩٢٦.

شایانی باسە ئەم سێ رۆژنامەیە هەرسێکیان سەرلەنوێ بە کتێبی سەربەخۆ چاپکراونەتەوە، ئەویش بەم جۆرە:

١- پێشکەوتن: یەکەمین رۆژنامەی سلێمانی ١٩٢٠-١٩٢٢.

کۆکردنەوە و ئامادەکردنی بۆ چاپ عەلی ناجی کاکە حەمە ئەمین عەتار و سیروان بەکر سامی.

پێشەکی: د. مارف خەزنەدار.

هەولێر – چاپخانەی رۆشنبیری ١٩٩٨.

٢- سێ رۆژنامەی رۆژگاری شێخی نەمر ١٩٢٣-١٩٢٤.

ئامادەکردنی: رەفیق ساڵح.

لێکۆڵینەوەی: د. کەمال فوئاد و سدیق ساڵح.

چاپخانەی بەدرخان – سلێمانی ٢٠٠١.

٣- ژیانەوە و شوێنی لە رۆژنامەنووسی کوردیدا ١٩٢٤-١٩٢٦.

کۆ و ساغ کردنەوەی: عەبدوڵلا زەنگەنە.

پێشەکی و پێداچوونەوەی: د. کەمال مەزهەر ئەحمەد.

چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە – هەولێر ٢٠٠٠.

هەواڵ و ئاگادارییەکان راستەوخۆ لەم سێ کتێبە وەرگیراون و لە نووسینەوەشیاندا هیچ دەستکارییەك لە شێوەی دارشتنیاندا نەکراوە، تەنیا ئەوە نەبێ کە بە رێنووسی ئێستا نووسراونەتەوە، ئەویش بۆ ئەوەی ئەرکی خوێندنەوەیان بۆ خوێنەری ئێستا ئاسانتر بێت.

ئەمەش هەواڵ و ئاگادارییەکانن:

**١- بۆ زانین:**

دارولموعەلیمینی بەغداد رۆژی ١٥ی ئەیلوولی ١٩٢٠ دەکرێتەوە ئەوانەی کە لە بیست ساڵ گەورەتر نین و شتێکیان خوێندووە و رەوشتیان چاکە بچن بۆ بەغداد لەم مەکتەبە قبووڵ دەکرێن. بۆ ئەوانەی کە لەم مەکتەبە قەید دەبن خواردن و خواردنەوە و جێگای باش و چرایان دەدرێتێ لەگەڵ دانی ١٥ رۆپییەش بۆ خەرجی.

خوێندن لەو مەکتەبە: ٢ یا ٣ ساڵە- لەپاش دەرچوون لە مەکتەبی ئەوەل جار مانگانەیان ١٥٠ و ٣٠٠ روپیە کەمتر نابێ. هەر چ کەس حەز دەکات بچێتە ئەم مەکتەبە بێتە دائیرەی سیاسی تەماشای شەرائیتی داخیل بوون بکات. ئەگەر ویستی بچێت بۆ بەغدا.

معاونی حاکمی سیاسی
کەپتان کستلیز
سەرچاوە/ رۆژنامەی (پێشکەوتن)
ژ/١٣، ٢٢ی تەمووزی ١٩٢٠، ل٤.

**٢- بۆ زانینی هەموو کەس:**

لەبەر گەورەیی شاری سلێمانی و ئارەزوو و شەوقی ئەهالی و بۆ خاتری مناڵیان زیاتر لە مەعاریف بەش وەرگرن و لە دووری رێگاوبان سەرماو گەرمای زۆر نەچێژن وا چاك بینرا کە مەکتەبێکی تر بکرێتەوە.

لەبەر ئەمە لە گەڕەکی دەرگەزێن ماڵی حاجی ئەحمەد چەلەبی مووسڵی چاك و پاك کرایەوە و کرا بە مەکتەبی ئەوەلییە. ئەو مەکتەبە چوار سنفی دەبێت ئەو دەرسانەی کە لە دوو سنفی ئەوەلییەو دوو سنفی ئیبتیدائی مەکتەبی نموونەیی سەعادەتا دەخوێنرێت لەوێشا دەخوێنرێن.

ئەو کەسانەی کە ماڵیان لەوێوە نزیکە لە ئەوەل ڕۆژی پاش جێژنەوە هەتا ئاخیری مانگی ئۆکتۆبەر (تشرینی اول) مناڵیان بەرن و بیاننووسن.

معاونی حاکمی سیاسی
کەپتان دگلس
سەرچاوە/ ڕۆژنامەی (پێشکەوتن).
ژ/١٨، ٢٦ی ئابی ١٩٢٠، ل٤.

**٣- مەکتەبی نموونەیی عیرفان:**

لەم ڕۆژانەدا هەنێ کەس ویستبوویان مناڵەکانیان بنێرنە مەکتەبی نموونەیی عیرفان لەبەر جێ کەمی هەنێ لەو مناڵانە قبووڵ نەکراون ئێستە لە ڕووی هەوڵدانی جەنابی سەعید زەکی ئەفەندی مودیری ئەم مەکتەبە سنفێکی تازە دانراوە لە پاش تەعتیلی بەهار دەکرێتەوە.

ئومێد وا دەکرێت کە ئەو کەسانەی کە ماڵیان نزیك ئەم مەکتەبەیە و حەزدەکەن مناڵیان لە مەکتەب بخوێنێت دیسان موراجەعەت بکەن بە سەعید زەکی ئەفەندی.

سەرچاوە/ ڕۆژنامەی (پێشکەوتن).
ژ/٥٠، ٧ی نیسانی ١٩٢١، ل٢.

**٤- مەکتەب:**

یەکی ئەم مانگە ڕۆژی یەکشەممە موحتەرەمی هەئیەتی تەعلیمییە و موعەزەزی قوتابییەکانی مەکتەبی نموونەیی سەعادەت چوونە سەیران بۆ سەر کارێزەکەی شێخ سەعید. معاونی شار جەنابی کەپتان هولت ساحیب و کاتبەکانی سیاسی و مالییە و قەزاییش دەعوەت کرابوون وەختێ کە جەنابی معاونی شار تەشریفی گەیشتە شوێنی

سـەیرانەکە قوتابییـەکان وەسـتان لەلایـەنی رەئـووف ئەفەنـدی قوتـابی سـنفی چـوارەم نوتقێکی بـەخێرهاتن خوێندرایـەوە. لـەپاش حەسـانەوە دەسـتکرا بـە یـاری هـەنیّ یـاری تازەش لە شانی قوتابییەکان درا. لە یاریـدا ئـەو قوتابیانـە کـە پێـشکەوتن و بردیانـەوە بەپێی لیاقەت ٣٠، ٤٠ قوتابیەك تەلّتیف کران و میقدارێکی موناسیب پارەیان درایە.

سەرچاوە/ رۆژنامەی (پێشکەوتن)

ژ/٥٤، ٥ی مایسی ١٩٢١، ل٣.

**٥- ئیعلان:**

لە ئیبتیـدای سـپتێمبەردا لـە ئـەوەل رۆژی ئـەیلوولی ١٩٢١ مەکتـەبی سـانەودی (لعدادی) گوشاد دەکرێت. لەم مەکتەبـەدا علـوومی تالیـە ئـەخوێنرێت. ((ئیعلانەکـە بەوەندە کۆتایی هاتووە و ناوی علوومەکان نەنووسراوە.ح.ف)).

سەرچاوە/ رۆژنامەی (پێشکەوتن)

ژ/٧٠، ٢٥ی ئابی ١٩٢١، ل٤.

**٦- ئیعلان:**

لە ئیعتیباری بیست و حەوتی ئەم مانگی ئاغستۆسە کە تەسادوفی رۆژی شەممە ئـەکا لە مەکتەبی نموونەیی سەعادەتدا دەستدەکریّ بە تەلەبە قەید کردن. ئەوانەی کە ئارەزوویان هەیە ئەولادیان فێری خوێندن و خوێندنەوە و نووسین ببیّ بیان بەن لە مەکتەب قەید بکرێن بۆ خاتری لە ئەوەل دەرسەوە لە دەرسخانەدا حازر بن و پاش نەکەون. مەحەللـەی گۆیـژە و کانی ئاسکان موراجەعەت بە مەکتەبی نموونەیی سەعادەت بکەن و مەحەللەی دەرگـەزێن و سەرشەقام و جوولەکان و چوارباخ موراجەعەت بە مەکتەبی نموونەیی عیرفان بکەن.

سەرچاوە/ رۆژنامەی (پێشکەوتن).

ژ/٧٠، ٢٥ی ئابی ١٩٢١، ل٤.

### ٧- هەواڵی تورك:

وەزارەتی مەعاریف لە ئەستانبۆڵ قراری داوە کە دەرسی دینیەو قورئان لە مەکتەبی کچاندا موعەلیمی پیاو بیلێتەوە.

سەرچاوە/ رۆژنامەی (پێشکەوتن).

ژ/٨٢، ١٧ی تشرینی دووەم ١٩٢١، ل٤.

### ٨- مەکتەبی سەنایع لە کەرکووك:

هەموو کەس دەزانێ کە سنعەت چەند لە پێشکەوتن و بەرزبوونەوە دابێ وڵاتیش ئەوەنە پێش و ژوور دەکەوێت.

باوکی منالآن لە سەریانە کە منالەکانیان بێ زانست دەرنەکەن و بەرزی نەیان هێڵیتەوە.

وا لە کەرکووك مەکتەبی سنایعی لەیلی کراوەتەوە ئەوانەی کە ئەیانەوێت ئیستیقبالی منداڵ و وڵاتیان رووناك بکەنەوە دەتوانن موراجەعەت بکەن بۆ قەید کردنی منداڵەکانیان لەو مەکتەبەدا.

شەرائیتی قبوولکردن وەك لای خوارەوە:

١- لە دە ساڵەوە هەتا ١٥ ساڵ قبووڵ دەکرێت.

٢- ئەوانەی دەنووسن و دوخوێننەوە تەرجیح ئەدرێن بەسەر هی تردا.

٣- لەشی ساغ بێ بەرگەی خەریك بوونی میکانیکی بگرێ لەنەخۆشی خراپ رووت بێ حەکیم تەماشای دەکات.

٤- لەلایەنی چاکێتی کردەوەی وەرەقەی موختار و ئەهلی گەڕەکی دەبێ ببێ.

٥- دەبێ تەسدیق نامەی ئەو مەکتەبەی کە لە دوای هەموو تیا خوێندووە بیبێ.

٦- بەپێی شەرائیتی سەرەوە ئەو تەلەبانە کە قەید و قبوڵ دەکرێن بۆ نەزارەتی مەعاریف دەبێ تەعەهودنامە و قۆنتەراتی چوار ساڵ ئیمزا بکەن.

٧- لە رۆژی ٣ی تشرینی سانییەوە هەتا مانگێك موعامەلەی قەید و قبووڵی تەلەبە دوایی دێت.

٨- بەپێی ئەو شەرائیتە کە لە سەرەوە نووسراوە تەلەبە لە کەرکوك قۆنتەراتەکە ئیمزا دەکات کەفیل یا وەسی نیشان ئەدات. بەواسیتەی حاکمی لیوا یا قەزای کە مەنسووبیتی و یا بە واسیتەی نازری مەعاریفەوە راستەوخۆ موڕاجەعەت بە مودیری مەکتەبی سنایعی کەرکوك کردنی لازمە.

مودیر مەکتەبی سنایعی کەرکوك

موهەندیس میکانیکی

سەرچاوە/ رۆژنامەی (پێشکەوتن)

ژ/٨٣، ٢٤ی تشرینی دووەم، ١٩٢١، ل٤.

**٩- ئیعلان:**

ئێمە کە بە شەو لە مەکتەب دەرسی ئینگلیسی ئەخوێنین بۆ مەعلوومات ئیعلانی ئەکەین هە چ کەس مەیلی فێربوونی ئینگلیسی هەیە مانگی ٣ روپیە بدا ئیستیفادە ئەکات ئەوانەی کە تالیبن شەوی یەکشەموو موڕاجەعەت بە مەکتەب بکەن.

شاگردانی مەکتەبی شەو

سەرچاوە/ رۆژنامەی (پێشکەوتن)

ژ/١٠٧، ١١ی مایس ١٩٢٢، ل٦.

**١٠- حەوادیسی داخیلی:**

رەشید زەکی ئەفەندی کە لە ئەسنای غەیبووبەتی مودیردا وەکالەتەن لە مەکتەبی ئیعدادی ئیفای وەزیفەی ئەکرد لە پاش هاتنەوەی مودیر لە قادروی تازەی مەعاریفدا بە موعەلیمیەتی ریازیات ئیفا فەرموورا بوو فەقەت لەبەر ئەمەی کە ئەحوالی سحیەی مانیعی دەوامی بوو لەسەر ئیستیرحاماتی خۆی لە وەزیفە عەفو کرا.

سەرچاوە/ رۆژنامەی (ئومێدی ئیستیقلال)

ژ/٤، ١١ی تشرینی یەکەم ١٩٢٣، ل٤.

### ١١- تەعین:

لەسەر ئیمای مودیریەت و تسویبی ریاسەتی عالیەی مەعاریف لە مونەوەرانی مەملەکەت جەنابی مەجید ئەفەندی مولازم بە ئیرادەی ملووکانە بە موعەلیمی ریازیاتی مەکتەبی ئیعدادی تەعین فەرمووراو تەبریك و موەفەقیەتی تەلەب دەکەین.

سەرچاوە/ رۆژنامەی (ئومێدی ئیستیقلال).

ژ/٤، ١١ی تشیرینی یەکەم ١٩٢٣، ل٤.

### ١٢- ئیبقا:

جەنابی شێخ سەعید ئەفەندی موعەلیمی مەکتەبی ئیعدادی کە لە تەنسیقاتی تازەدا خاریجی قادر و مابوودەوە بۆ ئەوەی کە خەلەل بە ئینتیزامی تەدریسات نەکا لەسەر لزومی موبرەم لە تەرەف مودیریەتەوە ئیبقای ئیستیرحام کرابوو لە جانیبی ریاسەتی عالیەی مەعاریفەوە و مەقامی ملووکانەیشەوە لطفاً تەسویب فەرموراو تەبریکی ئەکەین.

سەرچاوە/ رۆژنامەی (ئومێدی ئیستیقلال).

ژ/٤، ١١ی تشرینی یەکەم ١٩٢٣، ل٤.

### ١٣- بۆ مەکتەبلیەکان:

ئەوانەی کە قەیدیان لە مەکتەبا هەیە و مودەتێکە دەوام ناکەن ئەگەر بەتەمای دەوام و خوێندن بن لازمە لە ئیعتیباری رۆژی شەممەوە تا رۆژی پێنج شەممە موراجەعەت بە مەکتەب و ناوی خۆیان لە قەیدی تازەدا لە سەرەوە قەید و ئیتر مونتەزەمەن دەوامی مەکتەب بکەن ئەو تەلەبەی خیلافی ئەم ئیعلانە حەرەکەت بکات لە پاش هەفتەیەك رابوردنی ئەم ئیعلانە قەیدیان تەرقین و جارێکی تر لە مەکتەب قبوولٚ ناکرێن.

سەرچاوە/ رۆژنامەی (ئومێدی ئیستیقلال).

ژ/١٨، ٦ی مارت ١٩٢٤، ل٤.

### ١٤- ئیمتیحان و مەکتەب:

لە رۆژی ٢٠ی مانگەوە دەستکرا بە ئیمتیحانی مەکتەب لە خسوس مەکتەب و ئیمتیحانەوە قسەمان زۆرە فەقەت بابمێنێ بۆ رۆژی خۆی.

سەرچاوە/ رۆژنامەی (ژیانەوە).
ژ/٢٨، ٢٦ی حوزەیران ١٩٢٥، ل٣.

### ١٥- هەواڵی داخیلی:

هاتنەوە

لە هەفتەی رابوردوودا موعەلیم جەنابی عەلی عیرفان ئەفەندی و عەبدولڕەحمان ئەفەندی لە بەغدادەوە و جەنابی حوسێن مەزلۆوم ئەفەندی و موعەلیم جەنابی شێخ عەبدولڕەحمان ئەفەندی لە کەرکوکەوە تەشریفیان هێنایەوە سلێمانی عەرزی بەخێرهاتنیان ئەکەین.

سەرچاوە/ رۆژنامەی (ژیانەوە)
ژ/٣٩، ١٠ی ئەیلوول ١٩٢٥، ل٣.

### ١٦- رۆیشتن:

لە روفەقای موحتەرەمە کەریم بەگ سەعید بەگ هەفتەی پێشوو بۆ تەحسیل و خوێندن رۆیشتۆتە بەغدا تەلەبی موەفەقیەت و لە رێی خوێندندا دەوام و سوباتی تەمەننا ئەکەین.

سەرچاوە/ رۆژنامەی (ژیانەوە).
ژ/٣٩، ١٠ی ئەیلوول ١٩٢٥، ل٣.

**١٧- هاتن:**

حەفتەی رابوردوو جەنابی ساڵح ئەفەندی قەیتانچی بە مودیریەتی مەکتەب مودیری سەییارو وەکیلی غەزەتەی المفید قەیسی زادە جەنابی سەید مستەفا ئەفەندی بۆ کۆکردنەوەی بەدەلاتی ئیشتیراکی المفید تەشریفیان هێناوەتە سلێمانی عەرزی تەبریکی ئەوەلیان و بەخێرهاتنی هەردووکیان ئەکەین.

سەرچاوە/ رۆژنامەی (ژیانەوە).

ژ/٤٠، ١٧ی ئەیلوول ١٩٢٥، ل٤.

**١٨- ئەنجومەنی مەعاریف:**

زاتی حەزرەتی موتەسەڕیف بۆ پێشکەوتنی مەملەکەتەکەمان هیچ فورسەتێ فەرامۆش نافەرموێ تەرەقی وڵات لە دەرەجەی ئەووەلدا بە مەعاریف مومکین دەبێ. موشار الیە بۆ تەمامی ئەم مەقسەدە لە لیواکەدا تەشکیلی ئەنجومەنی مەعاریفی بە موناسیب و لازم زانی و جێبەجێی فەرموو.

لە ریاسەتی موشار ئیلەیهی دا ئەووەل جەلسە ئینعیقاد کردووە و کە قەراری لەسەر دراوە عەینەن تەقدیمی نەزەری قاریئی کیرام دەکەین.

سوورەتی قراری ئەنجوومەنی مەعاریفی سلێمانی

ژمارە-١ تەئریخ ٩٢٥/١١/١٢

رۆژی پێنجشەممە پاش نیوەڕۆ ئەنجوومەنی مەعاریف لەژێر ریاسەتی سەعادەتی موتەسەڕیفدا گردبووەوە ئەووەلەن لە تەرەف جەنابی موتەسەڕیفەوە نوتقێکی موختەسەر ئیرادو لەو نوتقەدا تەبریکی مەجلیس و تەمەننای تەرەقی مەعاریف و ئیبزالی مەساعی هەموو لایەك بۆ تەرەقی مەعاریف بەیانی فەرموورا. لە پاشان مەواداتی قەرار گیر بوو.

١- لەسەر تەلەبی دائیرەی مالییە تەنزیمی بودجەی ساڵی ١٩٢٦ی مەعاریفی لیوای سلێمانی لە مەکتەبی ئەووەل داواکرابوو. مودیری مەکتەبی مەزکوور لەسەر

ئەمە بە مەڕجەعی خۆی کە مودیریەتی مەعاریفی کەرکوکە موڕاجەعەتی کردووە. ئەم کەیفیەتە بالتەزەکور ئینتیزاری جەوابی مودیریەتی مەعاریف کەرکوك و لە تەئەخوردا تەئکید کردنی لە تەرەف مودیری مەکتەبەوە بە موناسب و موافیق بینرا.

٢- لەبەر ئەوەی کە ئاساری مەتبووعە بە زوبانی کوردی بۆ وڵاتەکە و با خسووس بۆ مەکاتیبی کوردی تەئسیرێکی گەورە و موستەحسەنی هەیە بۆ تەرجەمە و تەئلیفی ئاساری کوردی لە تەرەف موتەفەکرینی قەومەوە تەرغیبات و تەسهیلات کردن بە لازم بینرا. بۆ تەئمینی ئەم مەقسەدە تەرجەمەی ئەحوالی تەئریخی ریجالی ئیسلام و ئەوانەی تەعەللوقیان بە عێراقەوەیە موافیقی مەنهەجی سنفی دووەمی ئەووەلی لە تەرەف موئەلیفەوە بۆ تەدقیق و تەسحیح تودیع بە ئەنجومەن کراوە. سەبەب بە ئەهەمیەت و مەسلەحەتی ئەم مەسئەلەیە لە پاش تەدقیق و تەسحیح بۆ تەشەببوس بە تەبع کردنی ئەسەری مەزکوور ئیجتیماعی جەلسەیەکی فەوقەلعادە لە تەئریخی (٢٦-١١-١٩٢٥)دا موتتەفیقەن بە موافیق بینرا.

٣- لە مەکتەبی دووەمی سلێمانیدا (٢١) تەلەبەی مووسەوی مەوجوودە. تا ئێستا ئەولیای ئەم ئەتفالە بە دەفعات داوای تەعینی موعەلیمێکی دینیان کردووە لە نەفسولئەمردا تەلەب واقیع و مەعقوول و بۆ (٢١) تەلەبە تەعینی موعەلیمێکی دینی موناسیبە. لەبەر ئەمە بۆ تەعینی موعەلیمێکی کوردیزانی مووسەوی لە کەرکووك و با کەیفیەتی تەنسیب حەواڵەی ئێرە بکرێ بۆ تەبلیغی قبووڵ و ئیمتیحان، یا ئینتیخابی موعەلیمێك وەها لە مودیریەتی مەعاریفی مەنتیقەی کەرکووك بە موافیق و بۆ ئیستیحساڵی موافەقەتی قرار درا.

| شێخ محەمەد گولانی | مودیری تەحریرات | موتەسەریف و رەئیسی ئەنجوومەن |
|---|---|---|
| موعەلیم ئەووەلی مەکتەبی دووەم | | مودیری مەکتەبی ئەووەل |

سەرچاوە/ رۆژنامەی (ژیانەوە).

ژ/ ٥٠، ١٦ی تشرینی دووەم ١٩٢٥، ل٣و٤.

۱۹- عەلەنەن تەشەککور:

مەعاریف زۆر مەسروور و موفتەخیرە بە تەجەلیاتی موعاوەنەت و خزمەتی ئەفرادی میللەت لە رێی تەرەقی مەعاریفدا. لە غایەت بەدەر بەختیارین کە ئەم نەوعە مەفکوورەیە لە قەومی کوردیشدا سەرەتای دەرکەوت، تەبیعی شتی بچووکە گەورە دەبێت ئەمە لایەتە غەیروهو.

جەنابی میرزا کەریمی حاجی شەریف بۆ ئەمەی نەفعی بە مەعاریفی مەملەکەت بگەیێنێ ماکینەیەکی غرامافۆنی لوتفەن بە مەکتەب تەبەروع فەرموو بوو. هەیئەتی مەکتەب لە ئیستیفادەی کرد ختییە بانقەوە بە ئیشتیراکی مەئموورینی موحتەرەم لە نەتیجەدا ۷۳ روپیەی ئیستیفادە کرد و ئەساسێك بەدەستکەوت بۆ کرینی هەنگێ ئەشیای تەلەبەی کەشافە ئومێد ئەکەین کە ئەمە موقەدیمەی جەرەیانی حیمایەی مەعاریفە لە میللەتدا پەیدا بووە.

لە موقابیلی تەشەببوساتی مەبدەئی جەنابی میرزا کەریمدا عەرزی منەتداری و تەقدیمی تەشەککوراتمان بە وەجیبەی زیمەت زانی بژی دۆستانی مەعاریف.

مەکتەب

سەرچاوە/ رۆژنامەی (ژیانەوە)

ژ/٥٥، ۲۷ی کانوونی دووەم ۱۹۲٦، ل۳.

هەروەها رۆژنامەکان چەند هەواڵ و ئاگاداریی دیکەشیان بلاوکردووەتەوە، بەتایبەتی هەواڵی هەڵمەتی پارە کۆکردنەوە بۆ قوتابخانەکان، بەڵام لەبەر درێژیی لیستی ناوەکان بە پێویستمان نەزانی بیاننوسینەوە.

## سەرچاوە

* لە گۆڤاری (ئاسۆی پەروەردەیی) ژمارە (١٥)ی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٢دا بڵاوکراوەتەوە.

# ڕەخنەی ڕۆژنامەنووسی

## با لە قسەی هەق نەڕەنجێین*

ساڵی ١٩٩٨ ساڵی جموجۆڵی ڕۆژنامەنووسی بوو،لە سەرەتای ساڵەوە تاکو ئێستا جگە، لە چەندین چالاکیی ڕژنامەنووسی، ژمارەیەکی شیاویش کتێب چاپکراون.. دوا کتێب، کە تا ئێستا لە بارەی ڕۆژنامەنووسی کوردییەوە چاپکرابێ، کتێبی (کاروانی ڕۆژنامەگەریی کوردی)یە.

(کاروانی ڕۆژنامەگەریی کوردی) کتێبێکی(١٠٤) لاپەڕەییە لەلایەن کاک (وریا جاف)ەوە نووسراوە و دەزگای ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی (گوڵان) لە چاپی داوە و ژمارە (١٩)ی کتێبی گوڵانی دراوەتێ.

خوێنەر کە لاپەڕەکانی ئەم کتێبە هەڵدەداتەوە و بە چاوی وردبینییەوە دەیخوێنێتەوە دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە کتێبەکە یەکێکە لەو کتێبانەی گەلێك کەموکورتیی تێدایە و زۆربەی بابەتەکان چەند بارە کراون.

ئەوەی زیاتر هانیدام بڕیار بدەم باری سەرنج و تێبینییە ڕەخنەییەکانم لە بارەی ئەو کتێبەوە دەربڕم، دوو هۆی سەرەکی بوون:

یەکەم/ ئەو کتێبە یەکەمین بەرهەمی چاپکراوی نووسەر نییە لەبارەی ڕۆژنامەنووسییەوە، ساڵی ١٩٩٦ مێژووی ڕۆژنامەگەریی پارتی دیموکراتی کوردستانی بە (١١٣) لاپەڕە چاپکردووە و پێشکەشی بە کتێبخانەی کوردیی کردووە، بۆیە دەبووایە بەرهەمی تازەی باشتر و پوختەتر بێت کەچی بە پێچەوانەوەیە.

دووەم/ دەزگای ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی گوڵان کتێبەکەی لە چاپداوە و هەڵەچنیی بۆ کردووە، دیارە دەزگای گوڵانیش یەکێکە لە دەزگا ڕۆشنبیری و

راگەیاندنە هەرە بەتواناکانی کوردستان و ژمارەیەکی شیاو نووسەر و وەرگێڕو هەڵەچنی هەیە، کەچی کتێبەکە لەو رادەیە نییە کە دەزگاکە بتوانێت بەرگریی لێ بکات و بە کتێبێکی باشی دابنێت.

دەمەوێ لەو بابەتە رەخنەییەدا باری سەرنج و بۆچوونەکانم لە سێ لایەنەوە دەرببڕم:

یەکەم/ چەند تێبینی و سەرنجێکی گشتی.

دووەم/ رستە نارێك و لاوازەکان.

سێیەم/ هەڵە زمانەوانی و چاپەمەنییەکان.

## سەرنج و تێبینییە گشتییەکان:

١- ئەوەی سەیری ناونیشانی کتێبەکە بکات وای بۆدەچێ کە کتێبەکە باسی رۆژنامەنووسیی کوردی دەکات هەر لە سەرەتای دەرچوونی یەکەمین رۆژنامەی کوردی (کوردستان) لە ساڵی ١٨٩٨دا هەتا دەرچوونی کتێبەکە لە ساڵی ١٩٩٨، کەچی لە کتێبەکەدا تەنیا باسی (١٥١) رۆژنامەو گۆڤاری پێش راپەڕینی کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا مێژووی رۆژنامەنووسیی کوردی پێش راپەڕین ژمارەیەکی زۆر لەمە زیاتری بەخۆیەوە گرتووە، بۆ نموونە نووسەری ئەم بابەتە لە ساڵی ١٩٨٨ لە کتێبی (چەند لایەنێکی رۆژنامەنووسیی کوردی)دا بە دوو پێڕست ناوی (١٧٣) بڵاوکراوەی نووسیوە، دیارە لە دوای ئەم مێژووەش هەتا راپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ ژمارەیەکی دیکەی رۆژنامەو گۆڤاری کوردی دەرچووە، بەم پێیە دەبووایە ژمارەکە زۆر لەمە زیاتر با.

سەبارەت بە رۆژنامە و گۆڤارە نهێنییەکانیش، لە سێ لاپەڕەدا کورتە باسێکی لەبارەی رۆژنامەی نهێنی نووسیوە[١]، دیارە رۆژنامەنهێنییەکانیش لەمە زیاترن، بانووسەر سەیری بابەتی (رۆژنامەنووسیی نهێنی) بکات کە تێیدا باسی زیاتر لە (٣٠) بڵاوکراوەی نهێنی کراوە[٢].

بۆ قۆناغی دوای ڕاپەڕینیش تەنیا باسی (٤٦) ڕۆژنامە و گۆڤاری کردووە، کەچی ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ کتێبی (ڕۆژنامەنووسیی کوردی لە کوردستانی دوای ڕاپەڕین) دەبینین ناوی (٥٢٩) بڵاوکراوە هاتووە[٣]. بۆیە دەبینین جیاوازییەکە (ئاسمان و ڕیسمان)ە و کتێبەکە، وەکو بڵێی، کاری بە پەلەیی پێوە دیارە و بە نیوە چڵی ئەنجامدراوە.

٢- نووسەر لە پێشەکیی کتێبەکەیدا دەڵێ: (مەبەست لەم داڕشتنەوەیە نووسینی مێژوویەکی گشتی ڕۆژنامەگەریی کوردییە لە ماوەی سەد ساڵدا لە هەر شوێنێکی سەر ئەم زەوییە بەرینەدا بووبێ)[٤].

پاشان نووسەر خۆی لە هەمان پێشەکیدا دان بەوەدادەنێ کە کتێبەکەی تەنیا وەکو سەرەتایەك وایە.. ئەوەتە دەڵێ: (ئەم بەرهەمەش ببێتە سەرەتایەك بۆ نووسینەوەی مێژووی سەد ساڵەی ڕۆژنامەگەری کوردی)[٥].

٣- لەکاتی نووسینەوەی زانیارییەکان، وەکو دابونەریتێکی نووسین و ئەمانەتی ئەدەبی ئاماژەی بۆ سەرچاوەکانی نەکردووە، تەنیا لە کۆتایی کتێبەکەدا نەبێ.. لە هەموو کتێبەکەدا پەراوێزێك بەدی ناکرێ کە ئاماژەی بۆ سەرچاوەیەك کردبێ.

٤- لەبارەی چاپخانەی (کوردستان) دەڵێ: (لە ساڵی ١٩٤٧ پاش کۆچکردنی خاوەنەکەی بە یەکجاری بۆ شاری هەولێر گوێزراوەتەوە)[٦].

لە ڕاستیدا حوسێن حوزنی موکریانی لە سەردەمی ژیانی خۆیدا لە مانگی ئاداری ساڵی ١٩٣٦ چاپخانەکەی لە ڕەواندزەوە هێناوەتە هەولێر و ژمارە (٧-١١)ی گۆڤاری (ڕووناکی) لە ساڵی ١٩٣٦ لە هەولێر لە هەمان چاپخانەدا چاپکراوە[٧].

٥- لەبارەی چاپخانەکانی شاری دهۆکیش دەڵێ: (چاپخانەکان بریتین)[٨]، کەچی ناوی هیچ چاپخانەیەکی ئەو شارەی نەهێناوە!!.

٦- لە لاپەڕە (٩ و ١٠) ناوی ئەو کتێبانەی هێناوە کە بە کوردی و عەرەبی لە بارەی ڕۆژنامەنووسیی کوردییەوە دەرچووینە و تەنیا ناوی (١٥) کتێبی کوردی و (٣) کتێبی عەرەبی هێناوە، ئەویش بەبێ ڕەچاوکردنی مێژووی دەرچوونیان، واتە بە تێکەڵ و پێکەڵی نووسراون، کەچی ناوی زۆر کتێبی دیکەی نەهێناوە کە لەبارەی ڕۆژنامەنووسین وەکو:

أ- رۆژنامەی خورماڵ، شاکر فەتاح، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا ١٩٨٣.

ب- کۆمەڵە رۆژنامەی چەمچەماڵ، شاکر فەتاح، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا ١٩٨٣.

پ- رۆژنامەی ئاکرێ، شاکر فەتاح، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا ١٩٨٤.

ج- رۆژنامەی باسەرە، شاکر فەتاح، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا ١٩٨٥.

چ- بیبلۆگرافیای رۆژنامەی هاوکاری، بەشی یەکەم، مستەفا نەریمان، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی ١٩٨٩.

د- رۆژنامەنووسیی قوتابیان، حەمە سالح فەرهادی، چاپخانەی رۆشنبیری- هەولێر ١٩٩٢.

٧- لاپەڕە (١٠-١٨) بۆ ئەو وتارانە تەرخانکراوە کە بە کوردی و عەرەبی لە بارەی رۆشنامەنووسیی کوردییەوە بڵاوکراونەتەوە و تەنیا باسی (١٠١) وتاری کردووە، کەچی لە باسکردنەکەشدا بەرنامەیەکی دیار نییە وەکو ئەوەی وتارەکان بەپێی مێژووی دەرچوونیان بنووسرێن و کوردی و عەرەبییەکان لێك جودا بکرێنەوە.

شایانی باسە تائێستا نەك (١٠١) وتار بەڵکو زیاتر لە (٤٠٠) وتار لەم رووەوە بڵاوکراوەتەوە. لێرەدا بواری ئەوە نییە ناوی هەموو وتارەکان بنووسین، بەڵام بەڵێنی ئەوە دەدەم کە لە دەرفەتێکی نزیکدا بیبلۆگرافیای وتارە رۆژنامەنووسییەکانی ساڵانی هەشتاکان لە ١٩٨٠/١/١ هەتا ١٩٨٩/١٢/٣١ پێشکەش بە خوێنەری بەرێز بکەم کە تەنیا ژمارەی وتارەکانی ئەم (١٠) ساڵە لەو ژمارەیە زیاترە کە لە کتێبەکەدا هاتووە[٩]. بەڵام لێرەدا بە نووسەری بەرێزی رادەگەیەنم کە من تا ئێستا (١٥) بابەتم لە بارەی رۆژنامەنووسییەوە بڵاوکردووەتەوە کەچی ئەو ناوی هیچ کام لەم وتارانەی لە کتێبەکەیدا نەهێناوە، بۆ زیاتر ئاگاداریش وتارەکان ئەمانەن:

١- رۆژنامەنووسیی نهێنی، گۆڤاری (کاروان)، ژ/٢، ساڵی ١٩٩٢، ل٧٥-٧٧.

٢- ئازادیی رۆژنامەنووسی و کارامەیی رۆژنامەنووسان، رۆژنامەی (برایەتی)، ژ/٦، ١٦٢٦ لە ١٩٩٣/٤/٢٢، ل٦و٧.

٣- هەڵـە چـاپـەمـەنی و زمانەوانییـەکان لـە بـواری ڕۆژنامـەنووسـیی کوردیـدا ڕۆژنامـەی (کوردستانی نوێ)، ژ/٢٧٠ لە ١٩٩٣/٤/٢٢، ل٨.

٤- هەشـت بڵاوکـراوەی قوتابیـان، ڕۆژنامـەی (پێـشکەوتن)، ژ/٣٩، ئـاداری ١٩٩٣، ل٢.

٥- گۆڤاری (برایەتی)، ڕۆژنامەی برایەتی، ژ/١٧٩١ لە ١٩٩٣/١١/١٨.

٦- ڕۆژنامەنووسیی کوردیی قۆناغی دوای ڕاپەڕین لە دەروازەی پێنج ڕۆژنامـەوە، گۆڤاری کاروان، ژ/٨ خولی دوای ڕاپەڕین، ل٧٣-٨٥.

٧- ڕۆڵی قوتابیانی کوردستان لـە بـواری ڕۆژنامەنووسـیدا، خەباتی قوتابیـان و پێشکەوتن-ژمارەی هاوبەش- ١٩٩٤/٢/١٨، ل٦.

٨- شەرەفی ڕۆژنامەنووسی، ڕۆژنامەی برایەتی، ژ/٢٠٥٩ لە ١٩٩٤/١٠/٨، ل٨.

٩- ڕۆژنامەی (کوردستان)-دەرچوون و چالاکییەکانی-

ڕۆژنامـەی (کوردستانی نـوێ)، ژ/١٣٣٥ و ١٣٣٦ و ١٣٣٩ لـە ١٦ و ١٧ و ٢١ی تەمووزی ١٩٩٦.

١٠- گۆڤـاری ڕوونـاکی-گۆڤـاری زانـست و ئـەدەب و کۆمەڵایـەتی- کـاروان، ژ/١١٠، نیسانی ١٩٩٧.

١١- گۆڤاری (هەولێر)

گۆڤاری ئێستا، ژ/٦، تەمووزی ١٩٩٧.

١٢- ڕۆژنامەنووسیی کوردی دوای ڕاپەڕین و چەند سەرنجێکی ڕەخنەیی، گۆڤـاری ڕامان، ژ/١٥، ساڵی ١٩٩٧.

١٣- گۆڤاری(ڕووناکی) لە بیرەوەریی ٦٢ ساڵەی دەرچـوونیدا، ڕۆژنامـەی ڕێگـای کوردستان، ژ/٢٧٤ لە ١٩٩٧/١٠/٢٩.

١٤-ڕۆژنامەنووسی و ئەدەبی منداڵان، گۆڤاری (کاروان)، ژ/١١٦، ساڵی ١٩٩٧.

١٥- هەفتەنامـەی (گدیلە) و چەند سەنجێکی ڕەخنەیی، برایەتی ئەدەب و هونـەر، ژ/٦٩ لە ١٩٩٨/٣/٢٠، ل٤.

٨- وشە هەیە لە کتێبەکەدا بە چەند شێوە نووسراوە وەکو (ئەستەنبۆڵ) کە بە ئەستەنبۆڵ وئەستەمبول و اسطنبول نووسراوە.

٩- لاپەڕە (١٨-٢٤) بۆ قۆناغەکانی پەرەسەندن و گەشەپێدانی ڕۆژنامەگەریی کوردی تەرخانکراوە و نووسەر ناوی قۆناغەکانی هێناوە بێ ئەوەی ئاماژە بۆ ئەوە بکات کە چەند نووسەرێکی دی بەر لەم باسی قۆناغەکانی گەشەسەندنی ڕۆژنامەنووسیی کوردییان کردووە، بۆ نموونە: دوکتۆر عیزەدین مستەفا رەسووڵ لە کتێبی (حول الصحافة الكردية) و حەمە ساڵح فەرهادی لە کتێبی (چەند لایەنێکی ڕۆژنامەنووسیی کوردی)دا باسی قۆناغەکانیان کردووە.

١٠- لەلاپەڕە (٤٦) لە باسی گۆڤاری (ڕووناکی)دا دەڵێ:

(ئەوەی شایانی باسکردنە ئەوەیە مامۆستا مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی و حوسێن حوزنی موکریانی بە نووسینەکانیان بەشداری گۆڤارەکەیان دەکرد).

ئەگەر سەیری ژمارەکانی گۆڤاری (ڕووناکی) بکەین دەبینین ڕاستە حوسێن حوزنی ڕۆڵی سەرەکیی هەبووە و زۆر بابەتی بڵاوکردووەتەوە، بەڵام سەبارەت بە مامۆستا ڕۆژبەیانی ڕۆڵی هەر ئەوەندە بووە کە وەکو نووسەرێکی ئەو سەردەمەی وتاری بڵاوکردووەتەوە و شان بە شانی ئەویش نووسەران: شێت مستەفا، سەعید ناکام، مەحموود فەهمی، محەمەد عەلی کوردی، دڵدار، کانی، هیجری دەدە، بێخود، گیویی موکریانی، ئیسماعیل عەلی، جەمال ئەحمەد، یوونس مستەفاو چەندین ناوی خواستراویش وتاریان بڵاوکردووەتەوە[١٠].

١١- لە لاپەڕە (٤٨)دا دەڵێ: (گۆڤاری گەلاوێژ بە تەمەنترین گۆڤاری کوردییە). کەچی لە ڕاستیدا گۆڤاری (بەیان) بە تەمەنترین گۆڤاری کوردییە کە یەکەمین ژمارەی لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٩ دەرچووە و هەتا ئێستاش بەردەوامە، واتە ئێستا تەمەنی گەیشتووەتە (٢٩) ساڵ، کەچی گۆڤاری گەلاوێژ تەنیا (١٠) ساڵ ژیاوە.

١٢- لەلاپەڕە (٥٤)دا لەبارەی گۆڤاری (گڕوگاڵی منداڵانی کورد) دەڵێ: (تەنیا یەك ژمارەی لێ دەرچووە)، کەچی گۆڤاری (گڕوگاڵی منداڵانی کورد) سێ ژمارەی لێ بڵاوکراوەتەوەو بەم جۆرە:

* ژمارەی یەکەمی لە بەهاری ساڵی ١٩٤٦ دەرچووە.
* ژمارەی دووەم لە جۆزەردانی هەمان ساڵ دەرچووە.
* ژمارەی سێیەم لە پووشپەڕی هەمان ساڵ دەرچووە[11].

١٣- لەلاپەڕە (٥٥ و ٥٦)دا لەبارەی رۆژنامەی (هەولێر) دەڵێ: لە ١٢/١٩٥٠ (١٦) بڵاوبۆتەوە... پاشان دەڵێ: دوا ژمارەی لە رۆژی ١٢/١٩٥٣ (٢٨) بڵاوکراوەتەوە!

مێژووەکان بە هەڵە نووسراون و بەم شێوەیەیە:

١٦/١٢/١٩٥٠ و ٢٨/١٢/١٩٥٣.

١٤- ناوەکان هەندێکجار بە رێنووسی کوردی و هەندێك جاریش بە رێنووسی عەرەبی نووسراون.

١٥- لەکاتی باسکردنی رۆژنامەکاندا زانیارییەکان رێکوپێك و بە زنجیرە نین، هەندێکجار لە دوا دێڕدا دەڵێ کە یەکەمین ژمارەکەی دەرچووە وەکو: گۆڤاری (ژیان)، ل٦٦، لەگەڵ ئەوەی پێویستە ئەم جۆرە زانیارییانە لەسەرەتاوە باسیکرێن.

١٦- دووجار باسی گۆڤاری (چیا)ی قوتابیانی کردووە، جاری یەکەم لە لاپەڕە (٨٤) و جاری دووەم لە لاپەڕە (٨٦).

١٧- لە لاپەڕە (٨٦) لە بارەی بڵاوکراوەی (روانگە)وە دەڵێ: (کۆمەڵێك شاعیری نوێ (٣) ژمارەیان لێ بڵاوکردەوە). هەرچەندە دوکتۆر کەمال مەزهەریش هەر وای نووسیوە (١٢)، بەڵام لە راستیدا گرووپی (راوانگە هەمووشیان نەبوون، بۆ نموونە خوسێن عارف چیرۆکنووسەو لە پێشەنگاکان روانگەش بوو.

١٨- لە لاپەڕە (٨٧)دا لەبارەی گۆڤاری (نووسەری نوێ)وە دەڵێ: لە ساڵی ١٩٧٨ دوا ژمارەی لە بەغدا لە چاپدراوە.

گۆڤاری (نووسەری نوێ) لە مانگی ئاداری ساڵی ١٩٩٨ خولی دوای راپەڕینی لێ دەرچووە، تا نووسینی ئەم چەند دێڕە سێ ژمارەی بەم شێوەیە لێ دەرچووە:

- ژمارەی یەکەمی لە ئاداری ١٩٩٨ دەرچووە.
- ژمارەی دووەم ئایاری ١٩٩٨ دەرچووە.

- ژمارەی سێیەمی لە حوزەیرانی ١٩٩٨ دەرچووە.

١٩- لەلاپەڕە (٨٩)دا لەبارەی گۆڤاری (ئەستێرە)ی سلێمانی دەڵێ: ژمارەی یەکەمی لە هاوینی ساڵی ١٩٧٢ بڵاوکراوەتەوە پاشان بوو بە گۆڤاری بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیریی کوردی لە بەغدا.

دیارە نووسەر ئەو زانیارییەی هەر لە (تێگەیشتنی ڕاستی)[١٣] وەرگرتووە، بەڵام لە ڕاستیدا گۆڤاری (ئەستێرە)ی سلێمانی سێ ژمارەی لێ دەرچووە و وەستاوە، دەرچوونی ژمارەکانی (ئەستێرە) بەم شێوەیە بووە:

- ژمارەی یەکەمی لە هاوینی ساڵی ١٩٧٢ دەرچووە.
- ژمارەی دووەمی لە مانگی ئەیلوولی هەمان ساڵدا دەرچووە.
- ژمارەی سێیەمی لە شوباتی ساڵی ١٩٧٤ دەرچووە.

بەڕێوەبەرایەتی گشتیی ڕۆشنبیریی کوردیش لە بەغدا لە ساڵی ١٩٧٥ گۆڤارێکی دیکەی سەربەخۆی هەر بەناوی (ئەستێرە)وە دەرکردووە ئەویش دوو ژمارەی لێدەرچووە، بەڵام ژمارەی دووەمی پێش بڵاوکردنەوەی حکوومەت دەستی بەسەرداگرت و ڕێگەی بڵاوکردنەوەی نەدا.

٢٠- لە لاپەڕە (٨٩) لە بارەی گۆڤاری (بۆ پێشەوە) دەڵێ: (تەنیا یەك ژمارەی لێدەرچووە)، کەچی ئەو گۆڤارە دوو ژمارەی لێ دەرچووە.

٢١- لەلاپەڕە (٩٢) لە بارەی ڕۆژنامەی ڕۆژانەی (برایەتی)ی ساڵی ١٩٧٤ دەڵێ: تێکڕا (٢٦) ژمارەی لێدەرچووە.

ڕۆژنامەی (برایەتی) ژمارە (سفر)ی لە ڕۆژی سێ شەممەی ١٩٧٤/١/١ دەرچووە و جگە لەم ژمارەیە (٢٦) ژمارەی دیکەشی لێدەرچووە، ژمارە (٢٦)ی لە ڕۆژی پێنج شەممەی ١٩٧٤/٢/٧ دەرچووەو بە هەڵە مێژووی ١٩٧٤/١١/٧ی لەسەر نووسراوە. کەواتە بە ژمارە (سفر)ییەوە (٢٧) ژمارەی لێدەرچووە[١٤].

٢٢- هەر لەلاپەڕە (٩٢)دا لەبارەی ڕۆژنامەی (العراق) زانیاریی بڵاوکردووەتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەم ڕۆژنامەیە ڕۆژنامەیەکی عەرەبییە و با ئەوانەی دەریشی

دەچوێنن کوردبن.. خۆ ئەگەر بەو پێیە بێ دەبێ شیعرەکانی شەوقی و زەهاوی و رەسافی و نووسینەکانی عەقاد و قاسم ئەمینیش بە کوردی دابنێین چونکە خاوەنەکانیان لە بنەچەوە کورد بوون.

شایەنی باسە پاشکۆی رۆژنامەی عێراق کوردییە و نووسەر چاکی کردووە کە لە هەمان لاپەڕەدا باسی کردووە.

٢٣- لە لاپەڕە (٩٣)دا سەبارەت بە گۆڤاری (کاروان) دەڵێ: (تا سەرەتای ساڵی ١٩٩١ (٩١) ژمارەی لێ بڵاوکراوەتەوە. بە پێی ئەو نووسینە وا پێدەچێت نووسەری بەڕێز ئاگای لەوە نەبێت کە گۆڤاری (کاروان) لە دوای راپەڕین و دامەزراندنی وەزارەتی رۆشنبیری دەستی بە دەرچوون کردووەتەوە و هەتا ئێستاش بەردەوامە و تا نووسینی ئەم چەند دێڕە ژمارەی گەیشتووەتە (١٣٠) ژمارە.

٢٤- لەلاپەڕە (٩٤)دا باسی رۆژنامەی (ئاسۆ) و (بزاڤ)ی کردووە، بەڵام باسی ئەوەی نەکردووە کە ئەو دوو رۆنامەیە بە مەبەستی لێکترازاندنی هەردوو دیالێکتی کوردی، دیالێکتی کرمانجی ژووروو و خواروو دەردەچوون، چونکە یەکەمیان تەنیا بە شێوەی (سۆرانی) و دووەمیشیان هەر بە شێوەی (کرمانجی) شتی بڵاو دەکردەوە.

٢٥- لە لاپەڕە (٩٤ و ٩٥)دا بابەتێکی بە ناونیشانی (چاپەمەنی رێکخراوە کوردستانییەکان) بڵاوکردووەتەوە، کەچی تەنیا باسی شەش بڵاوکراوەی کردووە و پێنجیان هی یەکێتیی قوتابیانی کوردستانن! وەکو ئەوەی رێکخراوە کوردستانییەکان تەنیا ئەو شەش بڵاوکراوەیان دەرکردبێ!

لێرەدا دیسان بە نووسەری بەڕێزی کتێبی (کاروانی رۆژنامەگەریی کوردی) رادەگەیەنم کە نووسەری ئەم بابەتە رەخنەییە لە ساڵی ١٩٩٢دا نامیلکەیەکی بەناوی (رۆژنامەنووسیی قوتابیان)[١٥] بڵاوکردووەتەوە و تێیدا باسی (٦٦) بڵاوکراوەی قوتابیانی کردووە، پاشانیش بە بابەتێکی سەربەخۆ باسی (٨) بڵاوکراوەی دیکەشی کردووە[١٦]، واتە کۆی بڵاوکراوەکانی قوتابیان تا ساڵی ١٩٩٢ دەگەیشتە (٧٤) بڵاوکراوە، دیارە لەو ساوەش هەتا ئێستا کاروان بەردەوامە و بڵاوکراوەکانی قوتابیان

بەرەو زیادبوون دەچن و ئێستا ژمارەکە زۆر لەوەی تێپەڕاندووە کە باسکراوە.. ئەمە تەنیا هی قوتابیان، ئینجا هی هەموو رێکخراوە کوردستانییەکان دەبێ چەندبێ؟.

٢٦- لاپەڕە (٩٨-١٠٠) بۆ رۆژنامەگەریی نهێنی تەرخانکراوە، کەچی تەنیا باسی (١٩) بڵاوکراوەی کردووە و لەو (١٩) بڵاوکراوانەش هەندێکیان عەرەبین و ناچنەخانەی رۆژنامەنووسیی کوردییەوە، وەکو: (الشرارة) و (صدی کردستان) و (الشعلة) و (الجبهة الکردستانیة).

٢٧- لە بارەی قۆناغی دوای راپەڕینیش لە لاپەڕە (١٠٠)دا دەڵێ: (لە سەردەمی راپەڕینەکەی بەهاری کوردستانی عێراق لە ساڵی ١٩٩١ کۆمەڵێك رۆژنامە و گۆڤار لە ناوچە رزگارکراوەکان بڵاوکراونەتەوە).

رۆژنامە و گۆڤارەکانی لەدوای راپەڕین بڵاوکرانەوەتەوە نەك لە سەردەمی راپەڕین، وەکو نووسەر وای بۆچووە، ئەمە لەلایەك و لەلایەکی دیکەوە تەنیا باسی (٤٦) بڵاوکراوەی دوای راپەڕینی کردووە، کەچی ژمارەی بڵاوکراوەکانی دوای راپەڕین زۆر لەم ژمارەیە زیاترە، دیسان ئەوە دەڵێم با بگەڕێینەوە بۆ کتێبی (رۆژنامەنووسیی کوردی لە کوردستانی دوای راپەڕین) کە باسی (٥٢٩) بڵاوکراوەی ئەو قۆناغەی کردووە[١٧].

شایەنی باسە لەم (٤٦) ژمارەیەی قۆناغەکەدا ناوی رۆژنامەی (الأتحاد) و (گولان العربی) و (المؤتمر) و (نجم بین النهرین)ی هێناوە کە رۆژنامەی عەرەبین.

لە بارەی رۆژنامەی (یەکگرتوو)ش دەڵێ: (بزووتنەوەی یەکگرتووی ئیسلامی کورد دەری دەکات).

بزووتنەوەی یەکگرتووی ئیسلامی نا.. بەڵکو یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان.

### رستە لاواز و نارێکەکان

سەرەڕای ئەو تێبینییە گشتییانەی کە لە (٢٧) خاڵدا خستمە بەرچاوی خوێنەری هێژا، کتێبی (کاروانی رۆژنامەگەریی کوردی) چەندین رستەی لاواز و نارێکی وای

تێدایە کە دەبێ بخرێنە بەرچاو، لێرەدا وای بە پێویست دەزانم کە رستەکان وەکو خۆیان بنووسمەوە و ئەوەندەی لە توانای مندا هەبێ راستیان بکەمەوە:

١- گێڕانی فیستیڤاڵ کۆڕی رۆشنبیری، ل٢.

گێڕانی فیستیڤاڵ و کۆڕی رۆشنبیری.

٢- یەکەم رۆژنامە لە جیهان چاوی هەڵێنا رۆژنامەی (شکین بان)ی چینی کە لە ساڵی (٩١١)ی پێش زایین بڵاوبوودوە، ل٤.

پێویستە بڵێ: یەکەمین رۆژنامە کە لە جیهاندا چاوی هەڵێناوە رۆژنامەی (کین بان)ی چینی بووە کە لە ساڵی (٩١١)ی پێش زایین بڵاوبووەتەوە.

٣- هەرێمی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ل٥.

دەگوترێ: ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

٤- یەکەمین رۆژنامە لە لوبنان رۆژنامەی (مجمع الفوائد) کە لە ساڵی ١٨٥١ لە شاری بەیروت بڵاوبۆتەوە لەلایەن هەندێ گەڕۆکەکانی بیانییەوە، ل٥.

راستییەکەی: یەکەمین رۆژنامەی لوبنانی رۆژنامەی (مجمع الفوائد)ە کە لە ساڵی ١٨٥١دا لەلایەن هەندێ لە گەڕۆکە بیانییەکانەوە، بەتایبەتی ئینگلیزەکان، لە شاری بەیرووت بڵاوبووەتەوە.

٥- واتە تورکیا دەستپێشخەری لە چاپخانە و رۆژنامەگەریدا هەبووە پێش میسر و لوبنان و سوریا، ل٦.

واتە تورکیا پێش میسر و لوبنان و سوریا دەستپێشخەری لە چاپخانە و رۆژنامەگەریدا هەبووە.

٦- کاربەدەستانی ئەنقەرە گەلی کورد سەرکوت دەکات، ل٨.

کاربەدەستانی تورکیا گەلی کورد سەرکوت دەکەن.

٧- ئەم قۆناغە بە یەکەم پەرەسەندن و دەشەپێکردنی رۆژنامەگەری کوردی دەژمێردرێ، ل١٩.

ئـەم قۆناغـە بـە یەکـەم قۆنـاغی پەرەسـەندن و گەشـەپێکردنی ڕۆژنامەگـەری کوردی دەژمێردرێ.

٨- لە شاری بەغدا بڵاوبۆتەوە لەلایەن خوالێخۆشبوو جەمال بابان، ل٣١.

لە شاری بەغدا لەلایەن خوالێخۆشبوو جەمال بابانەوە بڵاوبۆتەوە.

٩- گۆڤاری ژین بابەتی کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئەدەبی بڵاوئەکردەوە و بە زمـانی کوردی و تورکی پیتی عەرەبی، ل٣٤.

گۆڤاری ژین بە زمانی کوردی و تورکی و بە پیتی عـەرەبی بابـەتی کۆمـەڵایـەتی و سیاسی و ئەدەبی بڵاوئەکردەوە.

١٠- لەسەرەتادا ناوی (ڕۆژی کورد)، ل٣٥.

لەسەرەتادا ناوی (ڕۆژی کورد) بووە.

١١- بە هەڵبەستەکانی سیف القضاة مەحەمەد جەمال الدین هەکاری ڕۆژنامەکـە ئەرازێنرایەوە، سەرەڕای هەواڵ و سەر وتار، ل٣٦.

ڕۆژنامەکە، سەرەڕای هەواڵ و سەروتار، بە هەڵبەستەکانی سەفولقوزات و محەمـەد جەمالەدین هەکاری دەڕازێنرایەوە.

١٢- وادەرئەکەوێ ڕۆژنامەکـە لـە کـاتێکی نائارامیـدا دەرچـووە لـە نێـوان شـێخ مەحمود و ئینگلیزەکان، ل٣٩.

واردەرئەکەوێ ڕۆژنامەکە لە کاتێکی وادا دەرچووبێ کە نائـارامی لـە نێـوان شـێخ مەحموود و ئینگلیزەکاندا هەبووە.

١٣- ئەم ڕۆژنامەیەش بابەتەکانی تەرخانکردبوو بۆ کوردایەتی وەك لە ژمارەکانیا دەرئەکەوێ، ل٤٠.

ئـــەم ڕۆژنامـەیـــەش، وەك لـــە ژمارەکانیـــدا دەردەکـــەوێ، بابەتـــەکانی بـــۆ کوردایەتی تەرخانکردبوو.

١٤- ئەوەی سەرنجڕاکێشانە، ل٤٣.

ئەوەی مایەی سەرنجڕاکێشانە.

١٥- خاوەنی ئەم دێڕانە لە ڕۆژی ١٨/١١/ ١٩٩٥ لە گۆشەی مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردی کردوویەتی، ل٤٧.

.... لە گۆشەی مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردی لەگەڵی کردووە.

١٦- ئەم گۆڤارە خزمەتێکی بێ پایانی گەلی کوردی بۆ ماوەی دە (١٠) ساڵ و وەچەیەکی تێگەیشتووی پێگەیاند، ل٤٨.

ئەم گۆڤارە بۆ ماوەی دە ساڵ خزمەتێکی بێ پایانی گەلی کوردی کردووەو... هتد.

١٧- پیرەمێردی تۆفیق، ل٤٨.

دەگووترێ: تۆفیقی پیرەمێرد یان حاجی تۆفیقی پیرەمێرد.

١٨- کەمتەرخەمی نەکردووە بۆ ڕۆژنامەکە بەرەو پێشکەوتنی ببات، ل٤٨.

بۆ بەرەوپێشخستنی ڕۆژنامەکە کەمتەرخەمیی نەکردووە.

١٩- سەرپەرشتی ڕۆژنامەکە گۆران، جەمیل سائیب، گۆرانی شاعیر، ل٤٩.

دیارە (گۆران) و (گۆرانی شاعیر) یەك کەسن.

٢٠- ژمارەی یەکەمی لە ڕۆژی (١٩٤٣/٣/٣) یەکەم ژمارەی بڵاوکرایەوە، ل٥٢.

ژمارەیی یەکەمی لە ڕۆژی (١٩٤٣/٣/٣) بڵاوکراوەتەوە.

٢١- وادەردەکەوێ هەریەك ژمارەی لێ بڵاوبۆتەوە، ل٥٧.

وادەردەکەوێ هەر یەك ژمارەی لێ بڵاوبووبێتەوە.

٢٢- ژمارەیەك نووسەری کوردی ناودار، ل٥٨.

ژمارەیەك نووسەری ناوداری کورد.

٢٣- لە لاپەڕە (٥٨)دا لەبارەی گۆڤاری (هەتاو) لە دوا دێڕدا دەڵێ: (پاش ئەوەی ١٨٨ ژمارەی لێ دەرچوو)، هەر ئەوەندە و خەبەرکە نالێ داخوا پاش ئەوەچی بەسەرهات؟!

٢٤- وادەردەکەوێ ئەم ڕۆژنامەیە ساڵێك ژیاوە، ل٥٨.

وادەردەکەوێ ئەم ڕۆژنامەیە ساڵێك ژیابێ.

٢٥- گۆڤاری هیوا بەجارێك و پوختی بڵاودەبووەوە، ل٥٩.

گۆڤاری هیوا بە ڕێکوپێك و پوختەیی بڵاودەبووەوە.

٢٦- باوکی هەوڵی زۆرداوە تا ئیمتیازی (شەفەق) جارێ تر وەرگرێتەوە، ل٥٩.

باوکی زۆر هەوڵی داوە تا جارێکیتر ئیمتیازی (شەفەق) وەربگرێتەوە.

٢٧- پاش ئەوەی قاسم لە رێبازی راستەقینەی شۆڕشی تەمموز، ل٦٢.

پاش ئەوەی قاسم لە رێبازی راستەقینەی شۆڕی تەمووز لایدا.

٢٨- بڕیاری داخستنی رۆژنامەی (خەبات)دا، ل٦٣.

بڕیاری داخستنی رۆژنامەی (خەبات)ی دا.

٢٩- مێژوویەکی پڕ لە شانازی بۆ خۆی تۆمارکرد لە مێژووی گەلی کورد و مێژووی رۆژنامەگەری کوردی، ل٦٣.

مێژوویەکی پڕ لە شانازی لە مێژووی گەلی کورد و مێژووی رۆژنامەگەریی کوردیی بۆخۆی تۆمارکرد.

٣٠- بەدەگمەن رۆژنامەی وا هەبوو بێ، ل٦٤.

ئەگەر بە دەگمەن رۆژنامەی وا هەبووبێ.

یان: بەدەگمەن رۆژنامەی وا هەبووە.

٣١- وادەردەکەوێ تەنیا دوو ژمارەی لێ دەرچووە، ل٦٦.

وادەردەکەوێ تەنیا دوو ژمارەی لێ دەرچووبێ.

٣٢- مەحەمەدی مەلا کەریم سەرپەرشتی بەشی کوردیەکەی بوو، ل٦٧.

محەمەدی مەلا کەریم سەرپەرشتی بەشی کوردییەکەی دەکرد.

٣٣- بەردەوام بوو لە بڵاوبوونەوە تا مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٢، بەشە کوردێکەی ١٢ ژمارەی لێدەرچوو، ل٦٧.

تا مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٦٢ بەردەوام بوو، بەشە کوردییەکەی ١٢ ژمارەی لێدەرچوو.

٣٤- چەند نووسەر و خاوەن بەتاوانی کورد هاوبەشی گۆڤارەکەیان بە نووسین دەکرد، ل٦٩.

چەند نووسەرو خاوەن قەڵەمی بە توانای کورد بە نووسین هاوبەشییان لە گۆڤارەکەدا دەکرد.

٣٥- بەردەوام بوو لە بڵاوبوونەوە تا ڕۆژی ١٧/١٠/١٩٦٧، ل٧٢.

تا ڕۆژی ١٧/١٠/١٩٦٧ لە بڵاوبوونەوە بەردەوام بوو.

٣٦- بڵاوکراوەتەوە بە زمانی کوردی و عەرەبی، ل٧٢.

بە زمانی کوردی و عەرەبی بڵاوکراوەتەوە.

٣٧- حزبی بەعسیش بەناوی ئەوەوە کەوتە دەرکردن و (التآخي) لە کۆتایی مانگی ئازاری ساڵی ١٩٧٤، ل٨٠.

حیزبی بەعسیش بەناوی ئەوەوە لە کۆتایی مانگی ئاداری ساڵی ١٩٧٤ کەوتە دەرکردنەوەی ڕۆژنامەی (التآخي).

٣٨- گۆڤارێکی بەخزمەت بوو سەرەڕای توانای سنووردار بوو، ل٨٨.

لەگەڵ ئەوەش کە توانای سنووردار بوو، بەڵام بە خزمەت بوو.

٣٩- لەو بارودۆخەپڕ لە ئاڵۆزەدا.

لەو بارودۆخە ئاڵۆزەدا.

٤٠- سەرەڕای ئەوەی گۆڤارەکە توانای سنووری هەبوو، ل٩٦.

سەرەڕای ئەوەی گۆڤارەکە توانایەکی سنووورداری هەبوو.

٤١- بەڵکو بەردەوام بوو لە بڵاوکردنەوە، ل٩٦.

بەڵکو لە بڵاوکردنەوە بەردەوام بوو.

٤٢- لە لاپەڕە (٩٨)دا دەڵێ: (بەو هیوایەی لە ئاییندەیەکی زوودا) ئیتر خاڵ داندراوە و کۆتایی بە ڕستەکە هاتووە بێ ئەوەی خوێنەر بزانێ لە ئاییندەیەکی زوودا چ دەبێت و چ ڕوودەدات؟!

٤٣- نیازمان وایە کتێبێکی تایبەتی بەو بزووتنەوەیەدا دابنێین لە دوا ڕۆژێکی نزیکدا، ل١٠٢.

نیازمان وایە لە دوا رۆژێکی نزیکدا کتێبێکی تایبەتی لە بارەی رۆژنامەگەریی کوردی لە ئەوروپا دابنێین.

## هەڵە زمانەوانی و چاپەمەنییەکان

سێیەمین خاڵ کە دەمەوێ دەستنیشانی بکەم ئەوەیە کە کتێبی (کاروانی رۆژنامەگەریی کوردی) ژمارەیێکی زۆر لە هەڵەی زمانەوانی و چاپەمەنی تێدایە کە هەر کەسێکی کوردیزان بیخوێنێتەوە بە ئاسانی بۆی بەدیار دەکەوێ.

وا لێرەدا ئەو هەڵە زەقانە دەخەمە بەرچاو لەگەڵ دیارکردنی وشەی راست و شیاو بەرانبەر هەر هەڵەیەك:

| هەڵە | وشەی بەرنبەری | لاپەرە |
|---|---|---|
| رۆژانامەش | رۆژنامەش | ٦ |
| دامەزراندنیوە | دامەزراندنیەوە | ٧ |
| ئەم چاپخانە | ئەم چاپخانەیە | ٧ |
| راوەدوتان | راوەدوونان | ١٨ |
| رێکخرازو پیشەسازییەکان | رێکخراوە پیشەییەکان | ٢٠ |
| ئەو نوشتیەی | ئەو نوشوستییەی | ٢٢ |
| جەنگی کەنداوی دووەم | جەنگی دووەمی کەنداو | ٢٣ |
| بۆە ئەبینین | بۆیە ئەبینین | ٢٨ |
| رەوشەی بەدرخان | رەوشەن بەدرخان | ٢٩ |
| گۆڤاری (رۆژی کورد) راگرت | گۆڤاری (رۆژی کورد)ی راگرت | ٢٩ |
| حاجی قادریی کۆیی | حاجی قادری کۆیی | ٣١ |
| گۆڤارە ئەلف و بێ یەکی نوێی | ئەو گۆڤارە ئەلف و بێیەکی نوێی | ٣١ |
| وەك دارشتنی رستەکاندا | وەك لە دارشتنی رستەکاندا | ٣١ |

| هەڵە | وشەی بەرنبەری | لاپەڕە |
| --- | --- | --- |
| ئەم رۆژنامە | ئەم رۆژنامەیە | ٣٢ |
| رۆژنامـــە، (تـــێ گەیـــشتنی راستی) | رۆژنامەی (تێگەیشتنی راستی) | ٣٢ |
| دوا ژمارە | دوا ژمارەی | ٣٢ |
| بوەوو | بووەو | ٣٣ |
| لە: لە ئەحمەد وەهبی، | لە: ئەحمەد وەهبی | ٣٤ |
| لە لاپەڕە ٢٣٣ کتێبەکەی | لە لاپەڕە ٢٣٣ی کتێبەکەی | ٣٤ |
| بوە | بووە | ٣٤ |
| والێخۆشبوو | خوا لێخۆشبوو | ٣٥ |
| بەم شێوە | بەم شێوەیە | ٣٥ |
| بوینە | بووینە | ٣٦ |
| نوسیوە | نووسیوە | ٣٦ |
| پوختەمەیان | پوختەکەیان | ٣٦ |
| ئەمە هەموو | ئەم هەموو | ٣٦ |
| ضیاعێکی گەورە | ضیاعێکی گەورە | ٣٨ |
| ئم رۆژنامەیە | ئەم رۆژنامەیە | ٣٨ |
| زمانی حاڵ | زمانی حاڵی | ٣٩ |
| وادیار | وادیارە | ٤٠ |
| دەســـتیان بەســـەر ســـلێمانی گرت | دەستیان بەسەر سلێمانیدا گرت | ٤٠ |
| نایەجێ | نابەجێ | ٤١ |
| لەم کۆبوونەوەدا | لەم کۆبوونەوەیەدا | ٤١ |
| وتیەتی | وتوویەتی | ٤٢ |

| هەڵە | وشەی بەرنبەری | لاپەڕە |
|---|---|---|
| گۆڤاری کرمانجی | گۆڤاری زاری کرمانجی | ٤٣ |
| خاوەن سەرنووسەری | خاوەن و سەرنووسەری | ٤٣ |
| گیوموکریانە | گیوی موکریانییە | ٤٣ |
| جار لەبە ئەوەی | جا لەبەر ئەوەی | ٤٣ |
| لەو ماوەدا | لەو ماوەیەدا | ٤٣ |
| ۆژنامەکە لە دوایدا | رۆژنامەکە لە دواییدا | ٤٤ |
| ئەم رۆژنامەش | ئەم رۆژنامەیەش | ٤٤ |
| رەنگ هەیە | رەنگە | ٤٥ |
| ژمارەی یەکەمی ١٩٣٢/٥/١٥ | ژمارەی یەکەمی لە ١٩٣٢/٥/١٥ | ٤٥ |
| حوزی | حوزنی | ٤٦ |
| لەو ماوەدا | لەو ماوەیەدا | ٤٧ |
| ووتاری | وتاری | ٤٧ |
| بۆ ئەو مدننە | بۆ ئەو موددەتە | ٤٧ |
| لەبەر | لەبەر ئەوە | ٤٧ |
| گۆڤاری هاواری | گۆڤاری هاوار | ٤٨ |
| بە نووسینەوە | بە نووسین | ٤٨ |
| مێژوویيەکی | مێژوویەکی | ٤٩ |
| رابگەینێ | رابگەیەنێ | ٥١ |
| کەڵەمەی دیلی و | کەڵەپچەی دیلی و | ٥١ |
| لەگەت ئەوەشدا | لەگەڵ ئەوەشدا | ٥٢ |
| پارتی دیموکراتی کوردستان | حزبی دیموکراتی کوردستان | ٥٣ |
| ئەم رۆژامەیە | ئەم رۆژنامەیە | ٥٤ |

| هەڵە | وشەی بەرنبەری | لاپەڕە |
| --- | --- | --- |
| رۆژنامەی هتاو | رۆژنامەی هەتاو | ٥٦ |
| بۆ ئێران | بۆ ئێران و | ٥٧ |
| بە گەلی کورد | بە گەلی کورد کردووە | ٥٩ |
| ناوی گۆڕدراوەتە | ناوی گۆڕاوە بە | ٦١ |
| مادەی (٣) دەستووری کاتی | ماددەی (٣)ی دەستووری کاتی | ٦٢ |
| ئەو رادەی | ئەو رادەیەی | ٦٦ |
| بلاوئەکردەوە | بلاوی ئەکردەوە | ٦٧ |
| بێ سڵ دەکردنەوە | بێ سڵ کردنەوە | ٦٨ |
| ئەم رۆژنامە بوو | ئەم رۆژنامەیە بوو | ٦٨ |
| کەریم زەنەی | کەریم زەند | ٦٩ |
| پڕ پیرۆ | بە پیرۆ | ٦٩ |
| بەشە کوردێکەی | بەشە کوردییەکەی | ٧٠ |
| بەشە کوردێکەی | بەشە کوردییەکەی | ٧١ |
| لە دوایدا | لە دواییدا | ٧١ |
| ئاشتیان ە | ئاشتییانە | ٧٤ |
| چەندە جارێك | چەند جارێك | ٧٤ |
| داخوازێکانی | داخوازییەکانی | ٧٥ |
| لەسەرەتای بلاوبوینەوە | لەسەرەتای بلاوبوونییەوە | ٧٦ |
| رێکەوتنامە | رێککەوتننامەکە | ٧٦ |
| رێکەوتنامەکە | رێککەوتننامەکە | ٧٧ |
| هەڵماڵێن | هەڵماڵینی | ٨٠ |
| لە یاد نەچوونی | لە یاد نەچووی | ٨١ |
| تەنیا ژمارەی | تەنیا یەك ژمارەی | ٨٢ |

| هەڵە | وشەی بەرنبەری | لاپەڕە |
| --- | --- | --- |
| بڵاونەکرایەوە | بڵاو ئەکرایەوە | ٨٢ |
| بەرەبەرکانی | بەربەرەکانی | ٨٧ |
| شباطی | شوباتی | ٨٧ |
| ژمارە یەکەمی | ژمارەی یەکەمی | ٨٨ |
| بەرەو رووناکیگۆڤارێکی | بەرەو رووناکی گۆڤارێکی | ٨٨ |
| رێکخراوی کوردستانیەکان | رێکخراوە کوردستانییەکان | ٩٤ |
| لە رۆنیۆ | بە رۆنیۆ | ٩٥ |
| راگیر | راگیرا | ٩٦ |
| ئەم سەدەوە | ئەم سەدەیەوە | ٩٧ |
| چاپەمەنی کورد | چاپەمەنیی کوردی | ٩٧ |
| لە تورکی | لە تورکیا | ٩٧ |
| حالێ | حاڵی | ٩٨ |

## سەرچاوەکان

* لە ژمارە (١٣١)ی گۆڤاری (کاروان)دا بڵاوکراوەتەوە، پاشانیش کاک (وریا جاف)ی خاوەنی کتێبی (کاروانی رۆژنامەگەریی کوردی) لە ژمارە (١٣٣)ی هەمان گۆڤاردا بەلاپەڕە و نیوێك وەڵامی ئەم رەخنەیەی داوەتەوە.

(١) وریا جاف، کاروانی رۆژنامەگەریی کوردی، ١٩٩٨، ل٩٨-١٠٠.

(٢) حەمە ساڵح فەرهادی، رۆژنامەنووسیی نهێنی، گۆڤاری کاروان-خولی دوای راپەڕین، ژ٢، ل٧٥-٧٧.

(٣) عەبدوڵڵا زەنگەنە، رۆژنامەنووسیی کوردی لە کوردستانی دوای راپەڕین، ١٩٩٨، ل٣٤١-٣٦٠.

(٤) وریا جاف، هەمان سەرچاوە، ل٣.

(٥) هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

(٦) هەمان سەرچاوە، ل٦-٧.

(٧) حەمە ساڵح فەرهادی، گۆڤاری رووناکی-گۆڤاری زانست و ئەدەب و کۆمەڵایەتی، کاروان ژمارە١١٠، نیسانی ١٩٩٧.

(٨) وریا جاف، هەمان سەرچاوە، ل٨.

(٩) شایانی باسە پاشان بابەتی بیبلۆگرافیایەکە لە گۆڤاری (کاروان) ژمارەی (١٤٠)دا بڵاوکرایەوە.

(١٠) حەمە ساڵح فەرهادی، گۆڤاری رووناکی، کاروان ژمارە ١١٠.

(١١) حەمە ساڵح فەرهادی، رۆژنامەنووسی و ئەدەبی منداڵان، گۆڤاری کاروان، ژمارە ١١٦، ١٩٩٧.

(١٢) دوکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، تێگەیشتنی راستی و شوێنی لە رۆژنامەنووسیی کوردیدا، چاپی بەغدا، ١٩٧٨، ل٢٥٦.

(١٣) هەمان سەرچاوە، ل٢٥٧.

(١٤) حەمە سالْح فەرهادی، گۆڤاری برایەتی، رۆژنامەی برایەتی، ژمارە ١٧٩١ لە ١٨/١١/١٩٩٣، ل٦.

(١٥) حەمە سالْح فەرهادی، رۆژنامەنووسیی قوتابیان، چاپخانەی رۆشنبیری-هەولێر، ١٩٩٢.

(١٦) هەشت بلاْوکراوەی قوتابییان، رۆژنامەی پێشکەوتن، ژمارە ٣٩، سالْی ١٩٩٣، ل٢.

(١٧) عەبدوللاْ زەنگەنە، رۆژنامەنووسیی کوردی لە کوردستانی دوای راپەڕین، چاپی هەولێر ١٩٩٨، ل٣٤١-٣٦٠.

# با له وه‌ڵامی دروست زویر نه‌بین*

هه‌ر لێره‌وه له سه‌ره‌تادا ده‌ستخۆشانه له کاك حه‌مه‌ساڵح فه‌رهادی ده‌که‌م، وه‌ك ره‌خنه‌گرێك چاوی به کتێبه‌که‌مدا خشاندووه که ساڵی ١٩٩٨ به‌ناوی (کاروانی رۆژنامه‌گه‌ری کوردی) له ده‌زگای رۆشنبیری و راگه‌یاندنی گوڵان به چاپ گه‌یشتووه.

به‌ڕێز مامۆستا فه‌رهادی (له‌ژێر ره‌خنه‌ی رۆژنامه‌نووسی)دا بابه‌تێکی به ناونیشانی (با له قسه‌ی هه‌ق نه‌ڕه‌نجێین) له ژماره‌ی ١٣١ی گۆڤاری کاروان بڵاوکردۆته‌وه.

به‌ش به حاڵی خۆم ره‌نگه که‌ڵکم له نووسینه‌که‌ی وه‌رگرتبێت، به‌ڵام له وه‌ڵامه‌که‌یدا زۆر هه‌ڵه‌ی زه‌قم به‌دی کرد! بۆیه ده‌ڵێم: (هۆ کاکه گه‌ر ماڵی خۆت له شووشه بوو، ئه‌وها به‌رد بۆ ماڵی که‌س مه‌هاوێژه). به‌ڕاستی زۆری و بۆری هه‌ڵه‌کان وای لێکردم، ماڵه‌که‌ی به‌ڕێزتان به شووشه بشوبهێنم.

ناشکوری نه‌بێت، نه‌خۆشی هه‌ڵه‌ی چاپه‌مه‌نی ته‌نها ئێمه‌ی کوردی نه‌گرتۆته‌وه، به‌ڵکو رۆژنامه ناوداره‌کانی جیهانیش له‌م جۆره هه‌ڵانه به‌ده‌رنین، نموونه‌ش زۆرن له‌وانه: حه‌یاتی له‌نده‌نی، واشنتۆن پۆست و نیویۆرك تایمزو...هتد، که بۆخۆم چه‌ندینجار هه‌ڵه‌ی زه‌قم تیایاندا به‌دیکردووه، که هه‌رگیز ئه‌م جۆره هه‌ڵانه ناچنه خانه‌ی ره‌خنه‌وه.

به‌ینی خۆمان بێت ئه‌مه پاساوێکیشه بۆ بابه‌ته‌که‌ی مامۆستا حه‌مه‌ساڵح، ئه‌گینا هه‌ڵه‌ی چاپ ئه‌و هه‌رایه‌ی پێناوێت که به‌ڕێزیان دروستیکردووه، له هه‌ندێ جێگادا برای نووسه‌ر ویستوویه‌تی هه‌ڵه‌ی چاپی کتێبه‌که‌م راستبکاته‌وه. ئه‌وه‌تانێ هه‌ر بۆخۆی که‌وتۆته هه‌ڵه‌ی زۆر زه‌ق و سه‌یر وه‌ك ئه‌م وشه‌و رستانه‌ی خواره‌وه، که له خشته‌که‌دا هاتوون:

| هەڵەی بەندە | ڕاستکردنەوەی کاکی نووسەر |
|---|---|
| نوسیوە | نووسیوە |
| دەستیان بەسەر سلێمانی گرت | دەستیان بەسە سلێمانید |
| پارتی دیموکراتی کوردستان مادەی | حیزبی دیموکراتی کوردستان دەستووری |
| (٣) دەستووری کاتی ئەم سەدەوە | کانی ئەم سەدەوە مادەی (٣)ی |

هەرچەندە من بە وردی گوڵبژێرم نەکردووە، دەبوایە برای نووسەر بەم جۆرە لایەنی زۆری نووسراوەکەی بۆ ئەم مەبەستە تەرخان نەکردبا، ڕەنگە ئەم لایەنە وا بەئاسانی بنبڕ نەکرێت، چونکە چیتر هەڵەی چاپ ناخەمەڕوو، با خوێنەرانی ئازیز بۆ خۆیان وردبینانە بە بابەتەکەیدا بچنەوە ئەوەدەمە هەڵەی پتریان بۆ دەردەکەوێت.

بەداخەوە هەر بەهۆی هەڵەی چاپەوە مانای تەواوی ڕستەیەك لای کاك حەمە ساڵح تێکچووەو هیچ واتاو مانایەك نابەخشێ کە لە دەستپێکی نووسینەکەیدا دبێژی: (ساڵی ١٩٩٨ ساڵی جموجۆڵی ڕۆژنامەنووسیە ببووە) ئاخۆ دەبێ کەس هەبێ لەم زمانە بگات!! خوێنەر با سەرپشك بێت. جگە لەوەش لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێ: (ئەو کتێبە یەکەمین بەرهەمی نووسەر نییە دەربارەی ڕۆژنامەنووسیەوە) دەبوایە بنووسێت: (ئەم کتێبە یەکەمین بەرهەمی نووسەر نییە دەربارەی ڕۆژنامەنووسی).

لە هەمووی سەیرتر نووسەر لە جێگەی دەزگای ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی گوڵانەوە قسە دەکاو دەڵێ: (کتێبەکە لەو ڕادەیە نییە کە دەزگاکە بەرگریی لێبکات و بە کتێبێکی باشی دابنێت).

پێموایە کتێبەکە نەك باش بەڵکو لەبار نەبوایە دەزگایەکی وەکو گوڵان بە چاپی نەدەگەیاند، با ئەو حوکمە بۆ دەزگاکە جێبهێڵین و پێشوەخت، دەزگاکە لەو ئاستە نزمەدا نییە کە هەرواو هاکەزایی کتێبێك چاپبکا... ئەوتە کاك حەمە صاڵح بۆخۆی وەڵامی هەڵەی خۆی داوەتەوە و دەڵێ: (دیارە دەزگای گوڵانیش یەکێکە لە دەزگا

ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنە هەرە بەتواناکانی کوردستان و ژمارەیەکی شیاوی نووسەر و وەرگێڕ و هەڵەچنی هەیە، کەچی...هتد).

نایەژم من مەلەوانێکی زانام لە دەریای ڕێزمانداو فرە ئاشنایەتیم لە زمانی کوردیدا هەیە، موعاناتی ئێمە لە دەرەوە، تەنها ئولفەت گرانی خوێندن هەستی پێدەکەن. گەر بەڕێزیان وەکو بەندە (٢٥) ساڵ زیاتر پەناهەندەی وڵاتێکی وەك ئەمەریکای دوورە دەست دەبوو، ئەودەمە دەمزانی بە چ زمانێکی شڕو شلۆق دەدوا، پێویست ناکات بەو جۆرە خۆی لە ڕیزی نووسەران و ڕەخنەگران لە قەڵەم بدات، چونکە خوێندنەوە و نووسین لە دوورە وڵات هێندە سانا نییە، هەروەکو برای ڕەخنەگر وای بۆچووە، پێموایە ئەمە کورتترین وەڵامە بۆ کاك فەرهادی. هەرچەندە نەدەبوا بۆخۆم ئەم لایەنەم ئاشکرا بکردبا بەڵکو نووسەر هەستی پێبکردایە چاکتربوو.

ئێمەی پەناهەندانی دەرەوە بەهۆی کێشەی نەتەوەییەکەوە دەربەدەری وڵاتان بووین و بۆ هەموو ئەو تراژیدیا و بێکەسی دوور لە زێد و ئازیزان ئۆقرەمان گرت و سنگ فراوان بووین، چۆن لە قسەی هەق دەرەنجێین، بەڵام پێموابێ برای نووسەر لەوە ناڕەحەت بووبێ، کە من لە کتێبەکەمدا وەك سەرچاوە ئاماژەم بە نووسین و کتێبەکانی ئەو نەکردووە، بەڵام وانییە گەر بهاتبایە نووسەر کتێبەکەی بە چاکی چاوپێدابخشاندبایە ئەوا بۆی دەردەکەوت کە من باسی بەڕێزیانم کردووە ناوی کتێبەکانیم لە بیبلۆگرافییەکەدا هانیوە.

بەر لە چاپدانی کتێبەکەش چەند جارێك بەڕێزیان بۆخۆی هەواڵی پرسیم و منیش پێم ڕاگەیاند کە ئێستا سەرقاڵی لەچاپدانی ئەو کتێبەم کە باسی لێوە دەکات، هەربۆیەش دەڵێم دەبوایە وەك هاندانێك ئامادەی خۆی دەربڕێ و هاوکاریم بکات، چونکە ئەوەی بەدەستم کەوتووە، تەنها لە ڕێگای دۆستایەتی و گەڕان بەدوویدا هەر ئەوەندەم چنگ کەوتووە.

باوەڕ بکەن شتێکی سەیرم لە ڕۆژنامەگەری کوردی و لە ڕەخنەکەی نووسەر لا گەلاڵە بوو، من نازانم بە چ پێوەرێك ڕۆژنامەی (الجبهة الكوردستانية و خبات و الأتحاد

و الـشرارة) و گۆڤـاری (گـولان العربـي و زاگـروس) ناچـنه خانـەی رۆژنامەگـەری کوردییەوە، رۆژنامەیەك زمانحاڵی حزبێکی کوردی بێت بە زمانی عـەرەبی دەربـچێت، باشە بۆچی لەسەر حیسابی رەوتی رۆژنامەگەری بیانی لە قەڵەم بدرێت، کە هەندێجار تەواو دژ بە بیروبۆچوونی ئەو زمانەیە کە زمانەکەی تێدا بڵاودەبێتـەوە، پێویستەئێمە ئـەم رۆژنامانـە بـە مـوڵکی خۆمـان بـزانین دەنـا بەرامبـەرەکان هـەرگیز لـە خانـەی رۆژنامەگەری خۆی ناخنێ.

پێویستە ئاماژەش بـەوە بـدەم کـە زۆر جێگـای خۆشـحاڵییە هێنـدە رۆژنامـە و گۆڤـار و بڵاوکـراوەی کـوردی زۆرن، زەحمەتـە کەسـێك بتـوانێ بـە تـەواوی لـە بیلۆگرافیایەکدا کۆیـان بکاتـەوە، چـونکە کـەم کـەس دەتـوانێ ئـەو ئەرکـە بـەبێ لـەیادکردنی بڵاوکراوەیـەك تـەواو بکـات. لـە کۆتایـشدا، داوای لێبـوردن لـە بـرای رەخنەگر دەکەم گەر زێدەڕۆییم کردبێ نابێ دڵی برەنجێت و لـێم زویـر بێـت، چـونکە قسەکانم راستە و خۆشیان گەواهی بۆ دەدەن.

**سەرچاوە**

* وەڵامی رەخنەی پێـشووە کـە کـاك وریـا جـاف وەڵامـی داوەتـەوە و لـە ژمـارە (۱۳۳)ی گۆڤاری (کاروان)دا بڵاوکراوەتەوە.

# هەفتەنامەی (گدیلە) و چەند سەرنجێکی رەخنەیی*

لەدوا مانگەکانی سەدەی یەکەمی تەمەنی پڕ شکۆی رۆژنامەنووسیی کوردی و لەرۆژی دووشەممەی ١٩٩٨/٣/٩ ژمارەی یەکەمی هەفتەنامەی (گدیلە) بە چوار لاپەڕەی رەنگاوڕەنگ دەرچوو.

منداڵە بێنازەکانی کوردستان مافی ئەوەیان بەسەر دەزگا رۆشنبیرییەکانەوە هەیە کە چەندین گۆڤارو هەفتەنامە و بڵاوکراوە و نامیلکەی تایبەتییان بۆ دەربکەن. هەفتەنامەی (گدیلە) دووەمین بڵاوکراوەی تایبەت بە منداڵانە کە لەلایەن وەزارەتی رۆشنبیرییەوە دەردەچێ، پێنج ساڵ پێش ئێستاو لە هەمان مانگدا گۆڤاری (هەنگ) لەلایەن هەمان وەزارەتەوە دەرچوو، تا ئێستاش بەردەوامە.

کە دەزگایەکی رۆشنبیری دوو بڵاوکراوەی تایبەت بە یەك مەبەست دەربکات، دەبێ بەلای کەمیی بڵاوکراوەی دووەم لە هەموو روویەکەوە بگاتە هی یەکەم ئەگەر باشتریش نەبێت، بەڵام بەداخەوە ژمارەی یەکەمی هەفتەنامەی (گدیلە) وادەرنەچوو و ئەگەر لەسە هەمان شێوە بەردەوام بێت و زوو فریای نەکەون پێشبینی دوارۆژێکی گەشەداری لێناکرێ، بۆیە بە پێویستم زانی، وەکو یەکێك کە ماوەیەکە گرنگی بە ئەدەبی منداڵان دەدەم و چەند ساڵێکیشە کاری تێدا دەکەم، ئەو کەموکورتییانەی کە لەم ژمارەیەم بەدیکردن بخەمە بەرچاوی بەرپرسیار و کارمەندانی هەفتەنامەکە و سەرجەم خوێنەرو خەمخۆرانی وشەی کوردی، بۆ ئەوەی بە هەموو لایەك رێگەچارەیەکی بۆ دابنێین و (گدیلە)ش بتوانێت بەباشترین شێوە خزمەتی منداڵی کورد بکا. دەبووایە کارمەندانی رۆژنامەی (هەرێمی کوردستان پێش دەرچوونی مارە یەکی (دیلە) بە ماوەیەکی شیاو سیمینارێکیان لەبارەی چۆنیەتی دەرچوونی هەفتەنامەکە بکردایە و

رای نووسەر و رۆژنامەنووس و پسپۆڕانی بواری نووسینی منداڵانیان وەربگرتایە، هەروەکو رۆژنامەی (هەرێمی کوردستان) ساڵێك و چەند مانگێك لەمەوپێش هەمان سیمیناری سازکرد بە بۆنەی دەرچوونەوەی و سیمینارەکەش سەرکەوتوو بوو.

ئەو خاڵانەی کە دەمەوێ لەم بابەتە رەخنەییەدا بیانخەمە بەرچاو ئەمانەن:

١- بەرای من (گدیلە) ناوێکی خۆش و مۆسیقاییە بۆ منداڵ و لەگەڵ جیهانی ئەواندا دەگونجێ، بەڵام گدیلە بۆ (کار) بەکاردێت نەك بۆ (بەرخ)، کەچی لەلای چەپی (گدیلە) وێنەی بەرخێك کراوە... هەرچەندە ئەو راستییە هەموو زمانزانێکی کورد دەیزانێ، بەڵام بۆ زیاتر سەلماندن بابگەڕێینەوە بۆ هەندێك لەو سەرچاوانەی باسی وشەی (گدیلە)یان کردووە:

أ- لە فەرهەنگی (ئەستێرە گەشە)دا هاتووە: گدی گدی: كلمة لأستدعاء الجدي و الماعز[1].

ب- لە (فەرهەنگی کشتوکاڵ)یشدا هاتووە: گدی گدی: بۆ بانگکردنی بزن و کارە[2].

ج- کاکەی فەللاحی شاعیریش دەڵێ:

گدی گدی کارەکەم

کارژۆڵە نازدارەکەم[3]

٢- بابەتی (دیاری) کە لەلایەن کاك (هوشیار نووری لەك)ەوە نووسراوە و لە لاپەڕە (٢)ی هەفتەنامەکەدا بڵاوکراوەتەوە، هەمان مانای بابەتێکی دیکەی نووسەر خۆیەتی کە بە ناونیشانی (منداڵ و داواکاری) لە ژمارە (٩ و ١٠)ی گۆڤاری (هەنگ)دا بڵاوکراوەتەوە. لە نووسینەکەی گۆڤاری (هەنگ) هیمداد داوای گۆڤاری هەنگ لە باوکی دەکات و لە هەفتەنامەی (گدیلە)شدا هەڵاڵە داوای رۆژنامەی (هەرێمی کوردستان) لە باوکی دەکات چونکە هەفتەنامەی گدیلەی لەگەڵدایە.

٣- لە بەشی (یەکترناسین)دا (ئەحمەد زانا موحسین) و (کاردۆ ئەحمەد)، کە هەردووکیان تەمەنیان دوو ساڵانە، نازانم چۆن لەو تەمەنەدا ئارەزووی خۆیان راگەیاندووە کە یەکەمیان ئارەزوویان لە تۆپ تۆپێن و مۆزخواردنە و دووەمیشیان ئارەزووی لە گۆرانی و هەڵپەڕکێی کوردی و خواردنی پرتەقاڵە!!

دنیایەکی سەیرە و منداڵی ئەو زەمانە زیرەکن! دەنا چۆن دەیانتوانی لە تەمەنی دوو ساڵیدا هاوار بکەن کە حەزیان لە مۆز و پرتەقاڵە؟! لەوانەیە ئەگەر وەرزەکە زستان نەبوایە و هەفتەنامەکە لە هاوین دەرچووبایە، ئەو کاتە ئارەزوویان لە ترێ و شووتی بوایە، چونکە لە هاویندا مۆز و پرتەقاڵ کەم دەستدەکەون.

٤- بابەتی (با دڵ پڕ لە گوڵ بێت و کوردستانیش پڕ لە دار و درەخت) کە لە لاپەڕە چواردا بڵاوکراوەتەوە و دوو ستوونی بەخۆیەوە گرتووە، بەڵام بە پێچەوانەی دابونەریتی نووسین و رۆژنامەنووسی، ستوونی یەکەم لای چەپ و هی دووەمی لای راستی بابەتەکە نووسراوە، واتە بابەتەکە بە پێچەوانەی نووسینی ئاسایی لەلای چەپ دەست پێدەکات. تۆ بڵێی نووسەرەکەی چەپڕەو بێت؟!.

سەرەڕای ئەم چوار خاڵەش هەفتەنامەکە لە رووی زمانەوانی و داڕشتنەوە ئەوەندە هەڵەی زۆرە نابێ لێی بێ دەنگ بین، چونکە ئەگەر کار وابڕوات، لەجیاتی ئەوەی هەفتەنامەکە زمانی منداڵ پاراو بکات، زمانەکەی لێ دەشێوێنێ!

١- لە هەفتەنامەی (گدیلە)دا خاڵبەندی رەچاو نەکراوە.

٢- زۆرجار جیاوازیی لە نێوان (ر)ی ئاسایی و (ڕ)ی قەڵەو نەکردووە و (ڕ)یە قەڵەوەکانی بە ئاسایی نووسیوە، وەکو: گەرایەوە...ل١، بروێنین... ل٣، دەروێنین... ل٣، نەرەنجا...ل٣، چاوەرانی...ل٣، سالرۆژی...ل٤، برازێنینەوە...ل٤.

٣- زۆرجار (ڵ)ی قەڵەو بە (ل)ی ئاسایی نووسراوە، وەکو: هەلدەگرێت...ل٢، بەلکو...ل٢، مالەوە...ل٢، سەرهەلدانی...ل٢، بەلام...ل٢، مندالان...ل٣، هەلبژاردن...ل٣، گول و گولزار...ل٣، کیژۆلەی...ل٣، هەلەبجە...ل٣، هەلمەتە...ل٤.

٤- (ێ)ی کراوە بە (ی)ی ئاسایی نووسراوە، وەکو: لەویدا...ل٣.

٥- هەندێجار لەجیاتی (و)ی پێوەندی (وە)ی عەرەبی بەکارهێنراوە، وەکو: بووکە شووشەکەی دایە دەست هاژەخان وە رۆژنامەی (هەرێمی کوردستان)یشی دایە دەست هەلالەخان.

٦- هەندێکجار ناوەکان بە رێنووسی کوردی نووسراون و زۆرجاریش بە عەرەبی، ئەوانەی کە بە رێنووسی عەرەبی نووسراون: محمد خدر مولود...ل١، صلاح...ل١، محمود عزیز...ل٤، شفیق قزاز...ل٤، خضر...ل٤.

٧- زۆر رستە و دەستەواژەی وا لە بابەتەکاندا هاتووە نارێك و لاوازن، وەکو:

أ- بۆ ئەوەی ئێمەش وەك ولآتانی تری جیهان خاوەن پەرلەمان و حکوومەتین و یاسا بەرقرارە بەم کوردستانە گوڵ و رەنگین شانازی بە رابەری خۆمان بکەین...ل١.

دەبووایە بنووسرێ: بۆ ئەوەی ئێمەش وەك ولآتانی دیکەی جیهان خاوەن پەلەمان و حکوومەت بین و یاسا بەرقەرار بێت و لەم کوردستانە گوڵ رەنگینەدا شانازی بە رابەری خۆمان بکەین.

ب- دەم و چاوەکانی دەشوات...ل٢.

کورد دەڵێ: دەم و چاوی دەشوات.

پ- چونکە ئەم بابەت و نووسینی بە سوودی تێدایە...ل٢.

دەبێ بڵێین: چونکە بابەت و نووسینی بە سوودی تێدایە.

ج- لاپەڕەکانی رۆژنامەی (هەرێمی کوردستان) هەڵدایەوەو...ل٢.

راستییەکەی: لاپەڕەکانی رۆژنامەی (هەرێمی کوردستان)ی هەڵدایەوەو.

چ- لە ساڵی ١٨٩٩ بە تەواوی هەردوو گوێچکەکانی کەڕبوون وە لە ١٨٢٦/٣/٢٦ کۆچی دوایی کردووە...ل٢.

نازانم چۆن بتهۆڤنی بلیمەت دوای مردنی بە (٧٣) ساڵ هەردوو گوێچکەکانی کەڕبوون؟!

د- دوو کیژۆڵەی جوان هەر دیکەتر بەرز دەکاتەوە...ل٣.

دەبێ بنووسرێ: دوو کیژۆڵەی جوان هەریەکە ئەویتر بەرزدەکاتەوە.

هـ- ئاريان شفيق قزاز تەمەنی بۆ ٧ ساڵان دەچێ لە پۆلی دووەمی سەرەتایی دەخوێنێ لە یەکێك لە قوتابخانەکانی لەندەن لە هەندەران...ل٤.

باشتر وابوو بنووسرێ: ئاریان شەفیق قەزاز تەمەنی بۆ ٧ ساڵان دەچێ، ئێستا لە پۆلی دووەمی سەرەتاییە لە یەکێك لە قوتابخانەکانی لەندەن.

و- ئاریانی چاوگەش کوردستانی خۆشدەوێت دوارۆژی ئەوەیە ئەندامێکی بە سوودی ئەم کوردستانە خۆشەویستە...ل٤.

دەبێ بنووسرێ: ئاریانی چاوگەش کوردستانی خۆشدەوێت و بە هیوای ئەوەیە لە دوارۆژدا ببێتە ئەندامێکی بە سوودی ئەم کوردستانە خۆشەویستە.

ز- ئەم وێنەی بۆ کێشاون بە دیاری بۆ ئێوەی ئازیز...ل٤.

راستتر وایە بنووسرێ: ئەم وێنەیەی بەتایبەتی بۆ ئێوەی ئازیز کێشاوە.

ئەمەو هەروەکو لەمەوپێش گوتمان هەفتەنامەکە هەڵەی چاپ و زمانەوانیی هێندە زۆرە کە لە رادەی ئاسایی دەرچووە، بۆیە بە پێویستی دەزانم بەم خشتەیە هەڵەکان دەستنیشان بکەم و راستیان بکەمەوە.

| هەڵە | ڕاست | ناوی بابەت | لاپەڕە |
|---|---|---|---|
| ئازار | ئادار | پەیڤێك | ١ |
| دیاریەکی | دیارییەکی | پەیڤێك | ١ |
| بەشداری ئێوە | بەشداریی ئێوە | پەیڤێك | ١ |
| هاریکاری ئێوە | هاریکاریی ئێوە | پەیڤێك | ١ |
| لەم وێنەدا | لەم وێنەیەدا | منداڵانی کوردستان | ١ |
| قوتابیانی | قوتابییانی | منداڵانی کوردستان | ١ |
| بە سرودی | بە سروودی | منداڵانی کوردستان | ١ |
| بارزانی نەمر | بارزانیی نەمر | منداڵانی کوردستان | ١ |
| حکومەتین | حکومەت بین | منداڵانی کوردستان | ١ |
| ئەم جاریان | ئەم جارەیان | بۆ جگەرگۆشەکان | ١ |
| دۆزیەوە | دۆزییەوە | بۆ جگەرگۆشەکان | ١ |
| بۆ قوتابیکە | بۆ قوتابییەکە | بۆ جگەرگۆشەکان | ١ |
| خۆشەویستی مامۆستاکەت | خۆشەویستیی مامۆستاکەت | ڕۆژتان باش | ٢ |
| پەپولە | پەپوولە | ڕۆژتان باش | ٢ |
| هەموو بەیانیەك | هەموو بەیانییەك | ڕۆژتان باش | ٢ |
| بە خەندەی پکەنین | بە خەندە و پێکەنین | ڕۆژتان باش | ٢ |
| بەیانیان | بەیانییان | ڕۆژتان باش | ٢ |
| فیلمە | فلچە | ڕۆژتان باش | ٢ |
| زوویر مەبن | زویر مەبن | ڕۆژتان باش | ٢ |
| کچە شرینەکەم | کچە شیرینەکەم | دیاری | ٢ |

| هەڵە | ڕاست | ناوی بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- | --- | --- |
| هەریم ی کوردستانی | هەرێمی کوردستان | دیاری | ٢ |
| نو (٩) (سەمفۆنی) | نۆ سەمفۆنی | هەرجارەو | ٢ |
| مۆسیقی | مۆسیقای | | |
| سەمفۆنی ژمارە (٢٣)وە | سەمفۆنی ژمارە (٢٣)یە | هەرجارەو | ٢ |
| بەشداری ناشتنی | بەشداریی ناشتنی | هەر جارەو | ٢ |
| ماوە بلێین | ماوە بلێین | هەرجارەو | ٢ |
| بە سودی | بە سوودی | هەرجارەو | ٢ |
| دەۆوەش | دەئێوەش | هەرجارەو | ٢ |
| زیدەکژو | زیرەکترو | یاری گوڵ و | ٣ |
| رازیکان | رازی بکات | یاری گوڵ و | ٣ |
| لە کۆتایدا | لە کۆتاییدا | یاری گوڵ و | ٣ |
| بەم شێوە | بەم شێوەیە | یاری گوڵ و | ٣ |
| یاری سابونە | یاریی سابوونە | یاری سابونە | ٣ |
| لە مانگی ئازارەوە | لە مانگی ئادارەوە | با دڵ پڕ لە گوڵ بێت | ٤ |
| لە گەڕایەوە | کە گەڕایەوە | مناڵە جوانەکان | ٤ |
| بەدەست ناسکەکانی | بە دەستە ناسکەکانی | مناڵە جوانەکان | ٤ |
| ئێسك سوك | ئێسك سووك | ئەم بەهرەمەندە | ٤ |
| گەشاوەخان | گەشاوخان | ئەم بەهرەمەندە | ٤ |
| قوتابیەکی | قوتابییەکی | ئەم بەهرەمەندە | ٤ |

دواجار دەبێ ئەوەش بڵێین هەفتەنامەی (گدیلە) لەم لایەنانەوە سەرکەوتووە:

١- کاغەزەکەی باشە.

٢- وێنەکانی جوانن و ڕەنگەکان باش فەرزکراون.

٣- نرخەکەی گونجاوە.

لەگەڵ داوای لێبووردنم لە خوشك و برایانی کارمەندانی هەفتەنامەی (گدیلە) و هیوادارم بە سنگێکی فراوان باری سەرنج و ڕەخنەکان وەربگرن و لە قسەی حەق نەڕەنجێن.. مەبەستیش تەنیا خزمەتکردنی زمانی کوردی و منداڵی کوردە.

## سەرچاوەکان

* لە (برایەتی ئەدەب و هونەر) ژمارە (٦٩)ی رۆژی هەینی ١٩٨٨/٣/٢٠دا بلاوکراوەتەوە.

(١) فازڵ نیزامەددین، فەرهەنگی ئەستێرە گەشە، چاپی بەغدا، ل٥٩٩.

(٢) مەعرووف قەرەداغی، فەرهەنگی کشتوکاڵ، چاپی بەغدا، بەرگی دووەم، ل٧٤.

(٣) کاکەی فەللاح، دیوانی جگەرگۆشەکان، چاپی بەغدا، ١٩٧٨، ل٣٨.

# ئەلبوومی رۆژنامەنووسانی کوردستان چۆن وادەبێت؟!

سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان و دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان سەرەڕای کورتیی تەمەنیان خزمەتی بەرچاویان پێشکەش بە رەوتی رۆژنامەنووسیی کوردی کردووە و زۆربەی کارەکانیان شایانی رێز و سوپاسن.

ئەو چەند سەرنجەی لێرەدا دەریاندەبڕم لە بارەی ئەو ئەلبوومەیە کە بە بۆنەی ۱۰۸ ساڵەی رۆژنامەنووسیی کوردییەوە بە ناوی (ئەلبوومی رۆژنامەنووسانی کوردستان) لەلایەن ئەم دوو دەزگایەوە چاپکراوە و هەروەکو لەسەر بەرگی یەکەمیدا نووسراوە، گوایە لەلایەن بەڕێزان مومتاز حەیدەری و مەحموود زامدار و حەمید ئەبووبەکرەوە سەرپەرشتی کراوە و وەکو یەکێك لە کارەکانی سێیەمین فیستیڤاڵی بەدرخان چاپ و پێشکەشکراوە.

ئەوەی لەکاری ئاوادا پێڕەو دەکرێت، رەچاوکردنی بەرنامەیەکی دیاریکراوە و وێنەکان بەپێی ئەو بەرنامەیە ریزبەند دەکرێن، بۆ نموونە: یان بەپێی تەمەنی رۆژنامەنووسەکان، یان بەپێی پیتە کوردییە باوەکان، یان بەپێی رۆڵیان لە رۆژنامەنووسی و جۆری خزمەتیان لەم بوارەدا.. تاد. کەچی لە ئەلبوومەکەدا هیچ بەرنامەیەکی لەم جۆرە رەچاو نەکراوە، بەڵکو کارەکە هەروا بە شێوەیەکی هەڕەمەکی ئەنجامدراوە. جگە لەمە، بۆ ئەوەی کارەکە واقیعی و زانستیانەتر بووایە، پێویست بوو:

یەکەم: وێنەی سەرجەم رۆژنامەنووسە بەرچاو و راستەقینەکانی بڵاوبکردایەوە، چونکە ئەو کارە وەکو بەڵگەنامەیەك دەمێنێتەوە و دەچێتە ناو ئەرشیفی رۆژنامەنووسیی کوردییەوە.

دووەم: وێنەی هەندێك لەو بەناو رۆژنامەنووسانەی بلاونەكردایەتەوە كە تەمەنی رۆژنامەنووسییان زۆر كورتە و كەس وەكو رۆژنامەنووس نەیناسیون، هەندێكیشیان تەنیا كارمەندانی دەزگای بەدرخانن و تازە چوونەتە ناو پیشەكەوە و هەندێكی دیكەشیان بە هیچ پێوانەیەك هەر رۆژنامەنووس نین!

هەرچەندە بەڕای من لەم دوو خاڵەی سەرەوەدا خاڵی یەكەمیان هێندەی خاڵی دووەم مەترسیدار نییە، چونكە سەبارەت بە خاڵی یەكەم راستییەك هەیە، ئەویش ئەوەیە نە سەندیكای رۆژنامەنووسان و نە دەزگای چاپ و بلاوكردنەوەی بەدرخان، رۆژنامەنووس دروستناكەن و ئەوان دانیپێدابنێن، یان نەنێن كەسانێك هەن رۆژنامەنووسی بەرچاون و لەم رووەوە بەرهەمیان دیارە، باهەر لەم جۆرە ئەلبوومانەشدا باسیان نەكرێ. بەڵام بۆ خاڵی دووەم گەواهیدانێكە بۆ هەندێك كەسی وا كە دەیانەوێ بە زۆر بیانكەن بە رۆژنامەنووس! بۆیە ئەمەیان زیاتر مایەی سەرنج و رەخنە لێگرتنە.

بۆ راستیش ئەوە دەڵێم كە لە ئەلبوومەكەدا ناو و وێنەی دەیان رۆژنامەنووسی پێشەنگ و كارامە و راستەقینەش بلاوكراوەتەوە، كە مرۆڤ ئەوپەڕی رێزی بۆخۆیان و وێنە و كارەكانیان هەیە و شایانی ئەوەن هەرچی بۆیان بكرێت.

ئەگەر ئەلبوومەكە بەناوی (ئەلبوومی سەندیكای رۆژنامەنووسانی كوردستان و دەزگای چاپ و بلاوكردنەوەی بەدرخان) بووایە، جگە لە دەستگوشین و پیرۆزبایی گەرم هیچ وشەیەكی دیكەم نەدەبوو، بەڵام مادام بە ناونیشانی (ئەلبوومی رۆژنامەنووسانی كوردستان)ە، هەموو رۆشنبیر و نووسەر و رۆژنامەنووسێكی كوردستان و خەڵكی دیكەش مافی ئەوەیان هەیە باری سەرنجیان دەربڕن، بۆیە لێرەدا لە هەردوو برای بەرێزم بەرپرسی دەزگای بەدرخان و نەقیبی سەندیكای رۆژنامەنووسانی كوردستان دەپرسم، چۆن بەرەوای دەزانن یەكەمتان زیاتر لە ۲۰ وێنەی خۆتان و دووەمتان زیاتر لە ۱۵ وێنە لە (ئەلبوومی رۆژنامەنووسانی كوردستان)دا بلاوبكەنەوە و دەیان رۆژنامەنووسی دیكەش فەرامۆش بكەن، كە خۆتان بەر لە هەموو كەسێك دەیانناسن

و رۆڵیان دەزانن؟! ئێ! وەکو پەندە کوردییەکەی خۆمان گوتەنی: (بەدرێژایی خۆت دەڕوانی بە پانیی خەڵکیشدا بڕوانە).

ناخۆشترین شت ئەوەیە مرۆڤ باسی خۆی بکات، هەروەکو زۆریش ناخۆشە کە مرۆڤ شتێك بنووسێت و نووسینەکە دڵی هەندێك برادەری ئازیزی پێ بڕەنجێ، بەڵام لە هەندێکجار و هەندێك هەلویستدا ناچار دەبێت. ئەمجارەیان سەبارەت بەمن وایە، بۆیە لە برای گەورەم کاك مومتاز حەیدەری دەپرسم، کاکە خۆ تۆ ناوت وەکو یەکەم ئەندامی لیژنەکە لەسەر بەرگی ئەلبوومەکەدا نووسراوە و ئەزموونی رۆژنامەنووسیت زۆرە و زۆربەی رۆژنامەنووسە راستەقینەکان دەناسیت و لەلایەکی دیکەشەوە خۆت بە کەسێکی پێشکەوتنخواز و عەلمانی دەزانیت و بەمەش ناسراوی کە رەخنە لە بچووکترین کاری نارێکی خەڵك دەگریت، دەڵێم رێزم بۆ ناو و وێنەی هەموو رۆژنامەنووسە راستەقینەکان هەیە و خۆم بە قوتابیی هەندێکیان و دۆستی نزیکی ئەوانی دیکە دەزانم، بەڵام ئایا نیوەی ئەوانی دیکە کە وێنەیان لە ئەلبوومەکەی ئێوەدا بلاوکراوەتەوە، نیو ئەوەندەی بەندە خزمەتی رۆژنامەنووسیی کوردییان کردووە؟ جەنابتان زۆر باش دەزانن تاکو ئێستا ٣ کتێبی چاپکراوم لەبارەی رۆژنامەنووسیی کوردییەوە بە چاپ گەیاندووە و زیاتر لە ١٠ بابەتی بلاوکراوەم لە بارەی رۆژنامەنووسییەوە هەیە و زیاتر لە ١٣ ساڵیشە بە بەردەوامی لە بواری رۆژنامەنووسیدا کاردەکەم، ئەم فەرامۆشکردنە بۆ؟!

باشە هەر بۆ نموونە، ئایا بەڕێزان سەرۆ قادرو بەدران ئەحمەد حەبیب و ئەحمەد قەرەنی و د. هیمداد حوسێن و کاروان عەبدوڵڵا و د. مەگدید سەپان و فەرەیدوون سامان و دەیانی دیکەش لەوانەی ئێوە فەرامۆشتان کردوون، کەمیان بۆ رۆژنامەنووسیی کوردی کردووە، یان بە پێوانەی ئێوە رۆژنامەنووس نین؟!

لە کۆتاییدا دەمەوێ دیسان بڵێم کە هەموو ئەو بەڕێزانەی لەم نووسینەدا ناوم هێناون و ناچاربووم رەخنە لە هەندێك لە کارەکانیان بگرم، بەبرای گەورە و ئازیزی خۆمیان دەزانم و رێزی تایبەتیم بۆ یەکە یەکەیان هەیە، بەڵام ئەوەی گوتوومە بەڕاستی دەزانم و راستییش لە سەرووی هەموو شتێکی دیکەوەیە.

## سەرچاوەکان

* لە رۆژنامەی (خەبات) ژمارە (٢١٥٧)ی رۆژی یەکشەممەی ٢٠٠٦/٥/٢٨دا بڵاوکراوەتەوە, پاشان هەریەك لە بەڕێزان مومتاز حەیدەری لە ژمارە (٢١٦١)ی رۆژی پێنجشەممەی ٢٠٠٦/٦/١ و فەرهاد عەونی لە ژمارەی (٢١٦٤)ی رۆژی یەکشەممەی ٢٠٠٦/٦/٤ و حەمید ئەبووبەکر بەدرخان لە ژمارە (٢١٦٨)ی رۆژی پێنج شەممەی ٢٠٠٦/٦/٨ بەدواداچوونیان لەسەر بابەتەکە کردووە, ئەگەر رۆژنامەکە لە کۆتایی بابەتەکەی کاك حەمید ئەبووبەکردا ئاماژەی بەوە نەکردایە کە چیتر بەدواداچوون لەسەر ئەم بابەتە بڵاوناکاتەوە، لەوانەبوو بابەتی دیکەیشی بەدوادابێت.

# مامۆستا فەرهادی راست دەکەی، ئەلبوومی رۆژنامەنووسانی کوردستان چۆن وادەبێت..؟!

**مومتاز حەیدەری**

بەرێز مامۆستا حەمەسالّح فەرهادی، سەرنووسەری گۆڤاری هەنگ، هاوکات لێکۆڵەرەوەیەکی ناسراوی مەیدانی رۆژنامەنووسییە، لە رۆژنامەی خەبات ژمارە (٢١٥٧) رێکەوتی ٢٨/٥/٢٠٠٦ لە لاپەڕە ٩دا، بابەتێکی رەخنەگرانەی باشی لەژێر سەردێری: (ئەلبوومی رۆژنامەنووسانی کوردستان چۆن وادەبێت) بلاوی کردبووەوە، ئەوەی راستی بێ، من بەش بە حالّی خۆم وەك خوێندەوارێکی کورد (لە دەرەوەی عەلمانییەت و رێبازی پێشکەوتنخوازی) بابەتەکەی مامۆستا فەرهادی بەگشتی زۆر باشە.. هەرچەند رەخنەکە دادگاییکردنی من بوو، بێ ئەوەی خاوەن ئاماژە بە خاوەن دەزگاکە و سەرچاوەی داراییەکەی ئەلبوومەکە بدرێ، کە زیاتر، بەڵێ زیاتر بە (میزاجی شەخسی) بوو. لەگەڵ ئەوەشدا رەخنەکەتان سەرچاوان، بەلام با منیش دوو قسە بکەم:

ئەوەی راستی بێ، ئەلبوومەکە زۆر کەموکوڕی تێدایە...! نەدەبووایە، رێگە بەخۆم بدەم ناوم لەسەر ئەلبوومەکەوە بێت...!! ئەوجاش دەڵێم مامۆستا فەرهادی پرسیارەکەتان زۆر بەجێیە، ئەلبوومی رۆژنامەنووسانی کوردستان چۆن وادەبێت..؟

پێشەکی دەڵێم: بەهیچ جۆرێ من لە رەخنەگرتن نیگەران نیم و نابم، ئەوەی رەخنەی بەجێ و راست قبوولّی نەبێ، ئەوە مرۆڤێکی داخراو و نایەوێ شت فێرببێ.. پێموایە خودی ئەم وەلامە، هەڵوێستی من لەمەڕ پیرۆزی رەخنەگرتن دەسەلمێنێ..

بەهەرحاڵ، با چیرۆکی ئەلبوومەکە زۆر بە کورتی باسبکەم، کە چۆن دروستبوو، یان چۆن وادروستبوو..؟

جاری یەکەم، بۆ فیستیڤاڵی دووەم، کە لە شاری دهۆك ئەنجامدرا، برای بەڕێز حەمید ئەبووبەکر سەرنووسەری رۆژنامەی بەدرخان و خاوەن دەزگاکە، پێشنیازی ئەوەی کرد، کە ئەلبوومێکی تایبەت بەبۆنەی جەژنی رۆژنامەنووسانی کوردستانەوە دروستبکرێت، هاوکات لیژنەیەکی چەند کەسی دروستبوو، کە من یەکێکیانی بووم.. هەڵبەت منیش پێمخۆش بوو، بەڵکو کارێکی باش دەکەین... بەڵام پێمگوت، ئەلبووم بەو درەنگ وەختە دروستنابێ، کە ماوەیەکی کەم لەبەر دەستە...! کاك حەمید فەرمووی، نەخێر فریای دەکەوین...

بەهەر جۆرێك لیژنەکە دروست لە (حەمید ئەبووبەکر، مومتاز حەیدەری، عەبدوڵڵا زەنگەنە، هاوڕێ محەمەد زادە، موسەدەق توفی) بوو.. ئەوەبوو یەکەم کۆبوونەوە، لە ماڵی من ئەنجامدرا، ئەوسا توانیمان هەر ئەم شەوە، بەپێی زانیاری هەموومان و سەرچاوەی ئەرشیفی من، کە لەبەردەستم دانان، شتێك گەڵاڵە کرا...!

بەلای منەوە بەناچاری پێی گوترا ئەلبووم، بەکورتی هەرچۆنێك بوو ئەلبوومەکە رۆژی ٢٠٠٥/٤/٢٢ لە دهۆك بڵاوکرایەوە، تاڕادەیەك مایەی رەزامەندی بوو، شایانی دووپاتکردنەوەیە، بڕوا بفەرموون، دیسان بە کاك حەمید ئەبووبەکرم گوت: تکایە ئەگەر نیازت وایە، دەزگای بەدرخان ئەلبوومێکی تەواو و راستەقینە، بڵاوبکاتەوە بەلای کەمەوە، ماوەی سێ مانگ پێشتر لیژنەکە دروستبکرێ و دەست بەکاربێت، بەڵام زۆر بەداخەوە هیچ نەکرا... دیسان کاك حەمید داوای کرد بێتە ماڵەوە، لەبارەی ئەلبوومێکی تازە، لەسەر بنەمای ئەلبوومی پێشتر قسە بکەین، هەم دیسان دەڵێم، ئەوە خودی کاك حەمید شوکر ماوە، گوتم: کاك حەمید ئەلبوومێکی باش و بێ کەموکورتی بەم چەند رۆژە ماوە بۆ یادەکە ناکرێ و دیسان تووشی کەموکورتی دەبین، گوتی چ سەرنج و پێشنیازت هەیە باسیدەکەین، هەر هەمووی جێبەجێ دەکەم(!)(!)

هەر ئەو شەوە من و کاك حەمید لە ماڵی ئێمەدا دانیشتین قسەمان لەبارەی ئەلبوومەکە کرد، تەنانەت پێشنیازی ئەوەم کرد، ناو و وێنەی زیاتر لە ١٠ خانمی رۆژنامەنووس بخرێتە ناو ئەلبوومەکە گوتی باشە، من جێبەجێی دەکەم. لەو زیاتر ١٠ ناوە تەنیا ناوی هاوژین حەمە رەشید بڵاوکراوەتەوە؟ هەتا ئەوەشی گوت: بۆ زوو کارەکە راپەڕێنن ئەم جارە، تەنیا سەرپەرشتی دەکەین، گوتم باشە...!! بەمەرجێ چارەسەری کەموکورتییەکان بکرێ.. گوتی: لە خزمەتدام، گوتم: باشە، پاش ئەوەی سکانەر دەکرێ، ئاگادارم بکە بەخۆم لەسەر کۆمپیوتەر تەماشای دەکەم... زۆر بە کورتی دوو سێ رۆژ بۆ سازدانی فیستیڤاڵەکە مابوو، تەلەفۆنی کرد، گوتی: وەرە دەزگا سەیری ئەلبوومەکە بکەن، منیش سەعات نزیکەی هەشتی شەو بوو، گەیشتمە دەزگای بەدرخان، دیم زۆر قەرەباڵغە و کاك مەحموود زامداریش لەوێنەو وردە سەیری لاپەڕەکانی ئەلبووکەمە دەکاو هەڵەکانی راست دەکاتەوە.!! منیش تەماشای هەندێکییکانم کرد، تەنانەت هەندێ سەرنجی بە پەلە لە شاباسم کرد، کاك حەمید لەگەڵم هاتە دەرەوە، گوتی حەز دەکەم کاك مەحموود زامداریش ئەندامی لیژنەکە بێت و ناوی بڵاوبکرێتەوە..!! منیش گوتم: باشە(!)(!) بەڕاستی من لە ناخ خۆم پەشیمان بووم.. بەڵام نەمدەزانی کەموکورتییەکانم چارەسەر نەکراون، خەمت نەبێ لە خزمەتداین.. بەکورتی، دووبارە دەڵێم ئەلبوومەکە ناتەواوە و کەموکورتی، وەك ئەلبوومێکی تەواوی تێکڕای رۆژنامەنووسانی کوردستان ئاشکرایە و دیارن.. لەگەڵ ئەوەش کارێك کراوە، بنەمایەك دروستبووە، بۆ ئەوەی ئەلبوومێکی سەرتاسەری کوردستانی دروستبکرێ.. دیارە هەر هەموومان پێویستە دڵسۆزانە درێژە بەو دەستپێشخەرییەی دەزگای بەدرخان بدەین... هەرکەسێ لەلای خۆیەوە، زانیاری و وێنەی دیکۆمێنتی پێویست بۆ دەزگای بەدرخان رەوان بکات. هاوکات، حەزدەکەم ئاماژەش بەوە بکەم کە سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان و خودی کاك فەرهاد عەونی-نەقیب- بە هیچ جۆرێ لە ناوەڕۆك و چۆنیەتی دروستبوونی

ئەلبوومەکە ئاگادارنین... لەلایەکی دیکەوە، سەبارەت بەخۆم دووبارە بە هیچ جۆرێ حەزم نەدەکرد ئەو ئەلبوومە وا دەربچێ...!؟ بۆیە لێرەدا رەخنەکەی مامۆستا فەرهادی بەسەرچاوان.. بگرە خۆم لە خۆم رەخنە دەگرم.. چۆن لە کارێکی وا شارستانی باش بە ناتەواوی بەشداریم کردووە...؟ هاوکات دەڵێم، بەڵام مەسەلەکە پەیوەندی بە خودی (عەلمانییەت و پێشکەوتنخوازی نییە) بە کورتی رەخنەگرتنی سوودبەخش زۆر باشە، هاوکات هیوام وایە بەڕێز کاك حەمید ئەبووبەکر کە خۆمە زۆر ماندوو دەکات-سوود لەو سەرنجانەی خەڵك وەربگرێ، هەڵبەت، دروستی هەر هەمووومان پێشکەوتنی کوردو کوردستانە.

**سوپاس**

**هەولێر- کوردستان**

# ڕوونکردنەوەیەکی پێویست دەربارەی دوو بابەتی ڕۆژنامەی خەبات

**فەرهاد عەونی**

ڕۆژنامەی (خەبات) لە ژمارەی ڕۆژی ۲۰۰٦/٥/۲۸ لە لاپەڕەی ۹ی کولتوورو بەدواداچوون دوو بابەتی بڵاوکردۆتەوە، کە لە نزیکەوە پەیوەندییان بە منەوە هەیە و هەندێ زانیاری هەڵەی تێکەوتووە کە پێویستە ڕاستبکرێنەوە[1].

دووەم: بابەتی (ئەلبوومی ڕۆژنامەنووسانی کوردستان چۆن وادەبێت)؟!

برای ڕۆژنامەنووس حەمەساڵح فەرهادی لەژێر ئەم ناوە بابەتێکی لە هەمان لاپەڕەدا بڵاوکردۆتەوە تێیدا هەندێ ناحەقی بەرامبەر سەندیکاو بەندەی تێدایە کە دەکرا پێش ئەوەی بابەتەکەی بڵاوبکاتەوە ئەگەر بە تەلەفۆنیش با ڕای ئێمەی بپرسیبایە بۆ ئەوەی ڕاستی مەسەلەکەی بۆ باسبکەین و نەکەوێتە ئەم هەڵەیەوە، چونکە:

١- سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان بە هیچ شێوەیەك پەیوەندی بە ئامادەکردنی ئەلبوومی ڕۆژنامەنووسانی کوردستانەوە نییە و ئاگاداری وردەکارییەکانی نەبووە، بۆیە بە هیچ کلۆجێك بەرپرسیاریەتی لە ئامادەکردنی ئەو ئەلبوومە نییە.

٢- ڕاستە ناوی هەردوو دەزگا لەبەرگی یەکەمی ئەلبوومەکە نووسراوە (سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان و دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان)، چونکە فیستیڤاڵی سێیەمی بەدرخان کە لە ڕۆژانی ۲۱-۲۰۰٦/٤/۲۳ لە هەولێر بەهاوبەشی هەردوو دەزگای ناوبراو ئەنجامدرا، بڕیارێکی پێشەکی هەبوو کە پۆستەر و

چاپەمەنییەکانی ئەم بۆنەیە ناوی هەردوو دەزگای لەسەر بێت، بەڵام وەکو لە پێشەوە باسکراوە سەندیکا دوور و نزیك ئاگاداری رێکخستنی ناو و وێنە و وردەکارییەکانی نەبووە و کاك حەمەساڵح فەرهایش خۆی ئیشارەتی بەوەداوە کە ئەو سێ بەڕێزەی ناوی هێناون (مومتاز حەیدەری، مەحموود، حەمید ئەبووبەکر) ئەوان ئەلبوومەکەیان ئامادە کردووە.

٣- بەندە ماوەیەکی دوور و درێژە رۆژنامەنووسی بەتوانا کاك حەمەساڵح فەرهادی دەناسم و رێزی تایبەتیم بۆی هەیە، لام وایە ئەویش زۆر باش من دەناسێ، بۆیە لام سەیرەو بە سەرسووڕمانەوە ئەو پرسیارەی کە کردوویەتی و دەڵێ (بۆیە لێرەدا لە هەردوو برای بەڕێز بەرپرسی دەزگای بەدرخان و نەقیبی سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان دەپرسم چۆن بەڕەوای دەزانن یەکەمتان زیاتر لە ٢٠ وێنەی خۆتان و دووەمتان زیاتر لە ١٥ وێنە لە ئەلبوومی رۆژنامەنووسانی کوردستاندا بڵاوبکەنەوە دەیان رژنامەنووسی دیکەش فەرامۆش دەکەن).

کاکی حەمە ساڵحی نووسەر و رۆژنامەنووس لە راستیدا لام سەیرە کە مرۆڤێکی وەکو تۆ تفەنگ بە تاریکییەوە دەنێت بەبێ ئەوەی بزانێ مەسەلەکە لە بنەڕەتدا چۆنە و چییە! جارێ لە خاڵی یەکەم بۆم روونکردیتەوە کەوا نە سەندیکا و نە بەندە بەهیچ جۆرێك پەیوەندیمان بە ئامادەکردنی ئەلبوومەکەوە نییە، بەڵام مەسەلەی بڵاوکردنەوەی ١٥ وێنەی من لە ئەلبوومەکەدا وەکو جەنابت ئاماژەت بۆ کردووە جارێ لە پێشەوە ئەو برایانەی کە لە نزیکەوە کاری رۆژنامەنووسییان لەگەڵ مندا ئەنجامداوە هەر لە ساڵی ١٩٧٢ەوە لە رۆژنامەی (التآخي) و (برایەتی) تاکو ١٩٧٤/٣/١١ و ساڵانی ١٩٩٢-٢٠٠٠ لە برایەتی پاشانیش هەردوو برایانی ئازیزم مومتاز حەیدەری و عەبدوڵڵا زەنگەنە ئەو شایەدییەم بۆ دەدەن کە من هەر لە سەرەتای دەرچوونی گۆڤاری (رۆژنامەڤانی) پاشانیش (رۆژنامەنووس) دژی بڵاوکردنەوەی وێنەی خۆم بووم و رۆژنامەی (الصحفی)یش بە دەگمەن و پێویستی نەبووبێت ئەویش وێنەی بە کۆمەڵ تاکو ئێستاکە تاکە وێنەیەکی منی تێدا نییە و دیسان کاکە حەمەساڵح فەرهادی باش

دەزانیێ کە بەندە (ئێرەو مەریخ) لە نەرجسییەت دوورم و یەکێ لەو شتانەی کە بەدرێژایی تەمەنم قێزم لێدەبێتەوە خۆدەرخستن و لەپێشەوە دانیشتنە لە هەموو کۆڕ و کۆبوونەوەکان، چ جای وێنە بلاوکردنەوە، بۆیە لێرەدا منیش ئەو پرسیارە ئاراستەی ڕۆژنامەنووس حەمەسالح فەرهادی دەکەم بە چ پێوەرێك جەنابتان گەیشتنە ئەو قەناعەتە کە من ١٥ وێنەی خۆمم بلاوکردۆتەوە.

دوا قسەشم بۆ کاك حەمە سالح ئەوەیە هیچ ڕۆژێك نەقیب و ئەندامانی ئەنجوومەنی سەندیکا و سەرۆکی لیژنەکان و سکرتێر و ئەندامانی لقەکانی سەندیکا لە نزیك و دوور باسیان لەوە نەکردووە کە سەندیکا ڕۆژنامەنووس دروستدەکات، چونکە کە جەنابت دەڵێی نە سەندیکای ڕۆژنامەنووسان و نە دەزگای بەدرخان ڕۆژنامەنووس دروستناکەن و ئەوان دانی پێدابنێن یان نەنێن کەسانێك هەن ڕۆژنامەنووسی بەرچاون... منیش لەگەڵ تۆدام کەسانێك هەن ڕۆژنامەنووسی بەرچاون وێنەشیان لە ئەلبوومەکەدا بلاونەکراوەتەوە باوەڕیش ناکەم کەسانێك هەبن تاکو ئێستاکە فەتوای ئەوەیان دابێت ئەوەی وێنەی بلاونەکرابێتەوە ڕۆژنامەنووس نییە، بەلام ئەم تەحەدایە لەپای چی!؟

دیسان بەداخەوە نەدەبا ڕۆژنامەنووسێکی وەکو کاك حەمەسالح فەرهادی بکەوێتە داوی هەڵچوون و بەم شێوەیە باسی لە پەیوەندبوونە ڕۆژنامەنووس و سەندیکا بەم شێوەیە شیبکاتەوە کە زیاتر دەکەوێتە خانەی (التحامل) کە تەنیا لەبەر ئەوەی وێنەی بەڕێزی لەم ئەلبوومەدا بلاونەکراوەتەوە.

٢٠٠٦/٥/٢٩

## سەرچاوەکان

(١) لەبەر ئەوەی بابەتی یەکەم پێوەندی بەم بابەتەوە نەبوو، بۆیە تەنیا بابەتی دووەممان لێ بڵاوکردووەتووە.

# وتەیەکی پێویست سەبارەت بە ئەلبوومی ڕۆژنامەنووسانی کوردستان

**حەمید ئەبووبەکر بەدرخان**

لە کاتێکدا لیژنەی باڵای دووەمی فیستیڤاڵی بەدرخان بڕیاریدا کە ئەلبوومێکی شایستە بە ڕۆژنامەنووسانی کوردستان دەربکات، بۆ ئەو مەبەستەش لیژنەیەك پێکهات لە (حەمید ئەبووبەکر، مومتاز حەیدەری، عەبدوڵڵا زەنگەنە، هاوڕێ محەمەد زادە، موسەدەق توفی) کە ئەلبوومەکە چۆن بێت و کێ ڕۆژنامەنووسە؟ بۆ ئەو کارە لۆگۆی زۆربەی بڵاوکراوەکانی سەردەمی کۆن و بەتایبەتی ئەوانەی سەرقافڵەی ڕۆژنامەوانی کوردین دابنرێت.

ڕۆژنامەنووس عەبدوڵڵا زەنگەنە ڕۆڵی کاراو ئەکتیڤی هەبوو (هەرچەندە زۆرجار دەیگوت کەموکوڕی زۆرە بەڵام وەکو هەنگاوی یەکەم باشە) لە دەستەبەرکردنی لۆگۆکان و هەندێك وێنەی ڕۆژنامەنووسان، وێنەکانی دیکەی هەموو ئەرشیفی خۆم و هاوڕێ زادەبوو. کاتێك ئەلبوومەکە بڵاوبۆوە، جێگای دەستخۆشی زۆربەی میوانان و ڕۆژنامەنووسان و ڕووناکبیران بوو، هەرچەندە بووە جێگای نارەزایی هەندێ لە ڕۆژنامەنووسان.. بەڵام بۆ سوود وەرگرتن لە کەموکوڕییەکان، لە سێیەمین فیستیڤاڵی بەدرخان دیسان بە دەستپێشخەری دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان بوو کە دەبێ ئەمساڵیش ئەلبومێکی شایستە بە ڕۆژنامە نووسان بڵاو ببێتەوە.. هەر بۆیە لەسەر ئەلبوومی پێشووتر کە (٤٨) لاپەڕە بوو، کە زیاتر لە (٦٥) لۆگۆی بڵاوکراوەو کتێبی ڕۆژنامەنووسی بەخۆوە گرتبوو لەگەڵ وێنەی زیاتر لە (١٦٥) ڕۆژنامەنووس، سەرەڕای هەندێك وێنەی دانسقە...

ئەمساڵ لە ٢٢/٤/٢٠٠٦ ئەلبوومی رۆژنامەنووسانی کوردستان بەشێوەیەکی نوێ و مۆدێرن کە لاپەڕەکانی بریتی بوون لە (١١٠) لاپەڕە و بە گۆڕانکاری و زیادکردنی چەندین رۆژنامەنووس کە لە هەر چوار پارچەی کوردستان تێکڕا (٢٦١) کەسن سەرەڕای دیکۆمێنت کردنی وێنەکانی فیستیڤاڵ (١-٢-٣) لەگەڵ وێنەی رۆژنامەنووسی، کە هەمووی لە ئەرشیفی خۆم هەبوون. لە ژمارەکانی بەدرخان چەندینجار بانگەوازمان کردووە کە ئەوانەی رۆژنامەنووسی بە ئەزموونن وێنەکانیان بنێرن.. بۆ ئەوەی لە ئەلبوومەکە بڵاوبکرێتەوە.. ئەلبوومەکە بێ کەموکوڕی نییە، بەڵام مانای ئەوەش نییە کە کارێکی خراپ کراوە.. خۆ من دڵنیام برایان (زەنگەنە و حەیدەری و زامدار و بەدرخان) هەریەکەو لای خۆیەوە حەزیان دەکرد باشترو هەرچی رۆژنامەنووسی بە ئەزموونە وێنەی تێدا بڵاوبکرابایەوە.. خۆ باشتر دەزانم چەندین مامۆستاو بەرپرسی دەزگا و کچانی رۆژنامەنووس هەیە ناو و وێنەیان بڵاونەکراوەتەوە.. ئەگەر ئێمە چەند خەتابار بین، ئەوەندەش خەتاکە لە ئەستۆی خۆیاندایە!! چونکە زۆربەی رۆژنامەنووس خۆیان وێنەیان ناردووە, لەوانە: (بێوار عەبدولڕەحمان، نەریمان عەبدوڵلا، مەهدی جەبار، بەرهەم عەلی (چەندین وێنەی رۆژنامەنووسانی لە ئەرشیفی خۆی هێناوە) هەروەها وێنەی رۆژنامەنووسانی هەر چوار پارچەی کوردستان لە رێگەی ئیمیل و نامەوە گەیشتووە لەگەڵ رۆژنامەنووسە کوردەکانی ئەوروپا..هتد).

بەڕێز (حەمەساڵح فەرهادی) لە بابەتێکی رۆژنامەی خەبات ژمارە (٢١٥٧) رێکەوتی ٢٨/٥/٢٠٠٦ لەژێر سەردێری ئەلبوومی رۆژنامەنووسانی کوردستان چۆن وادەبێت؟! نووسیویەتی (بەدرێژایی خۆت دەڕوانی بە پانیی خەڵکیشدا بڕوانە) دیارە فەرهادی مەبەستیەتی بڵێ: بۆچی پڕیەتی لە وێنەی کادیرانی دەزگای بەدرخان و ئەرشیفکردنی وێنەی فیستیڤاڵەکانی بەدرخان و گەشت و چالاکییەکانی ستافی بەدرخان. منیش پرسیارێك لە فەرهادی دەکەم؟ بۆچی ژووژك دەڵێ: (بێچووی من لووس و جوانە) لێرەدا دەخوازم بە فەرهادی بڵێم: بەڕێزتان سێ رۆژ لە فیستیڤاڵ

میوان بوون دەکرا بابەتێکی شایستە بە فیستڤاڵ بڵاوبکەیتەوە لە پەنای ئەوەدا رەخنە ئاراستەی بابەتەکان و بڵاوکراوەکان و چالاکییەکان بکەیت چونکە هەموومان دەزانین بەڕێزتان رۆژنامەنووسی بواری منداڵانن و لەم بوارەدا چەندین کتێبتان بڵاوکردۆتەوە کە بەداخەوە تاکو ئێستا هیچ کامێکیانم نەبینیوە..!

بەهەرحاڵ بە نیسبەت وێنەکانی نەقیبی رۆژنامەنووسانەوە کەم و زۆر کەسیان ئاگادارنین بەڵکو خۆم لە ئەرشیفی خۆم ئەم وێنانەم داناوە. دیسان لە فەرهادی دەپرسم: دیارە دەزانی ئەوەی کاردەکات خەڵکان قسەی لەسەر دەکەن.. بۆیە دەزگای بەدرخانیش شانازی بە کارەکانی خۆیەوە دەکات چونکە چۆن من ئازادم لە بیروڕا ئاواش خەڵکان ئازادن.. مەبەستم ئەوەیە بە فەرهادی بڵێم: بۆچی پێشی ئێمە کەس بیری لە ئەلبوومێك نەکردۆتەوە بۆ رۆژنامەنووسان؟ دڵنیابە لە ئێستاوە ئەگەر بەڕێزتان قبووڵتانە لەگەڵ ئەو لیژنەیەی دانراوە بۆ ئەلبووم دەتوانی تۆش ببیتە ئەندام.

سەبارەت بە قسەکانی مومتاز حەیدەری هیچ شتێکم نییە تەنیا ئەوە نەبێت کە پارو ئەمساڵ لێك جوودا ناکاتەوە. لە وتارێکی رۆژنامەی خەبات ژمارە (٢١٦٤) رێکەوتی ٢٠٠٦/٦/٤[١] دەڵێ پێشنیازی ئەوەم کرد ناو و وێنەی زیاتر لە دەخانمی رۆژنامەنووس بخرێتە ناو ئەلبوومەکەوە تەنها ناوی هاوژین حەمە رەشید بڵاوکراەتەوە. سەبارەت بە ٩ کچەکەی دیکەش ئەوە ناوی چەندین کچ و ژنە رۆژنامەنووسی هەرچوار پارچەی کوردستان کە ژمارەیان نەك ٩ کەس بەڵکو ژمارەیان ١٤ کەسە. سەبارەت بە نووسەر و رۆژنامەنووسی هەڵکەوتوو مەحموود زامدار خۆم داوام لێکردووە بەڵکو ئەگەر کاتی هەبێت یارمەتیمان بدات لە کەموکورییەکان، داواکەی منی قبووڵکرد و بۆ سێ رۆژ لەسەر یەکتر کاری تێدا کرد و هەڵەکانی چاککردەوە و هەقی خۆیەتی وەکو من و حەیدەری شەرەفی ئەوەی پێبدرێت کە ناوی لەسەر ئەلبوومەکە بنووسرێت.

لە کۆتاییدا دەمەوێت بڵێم: داوا لە هەموو دەزگا رۆژنامەنووسی و رۆژنامەکانی کوردستان دەکەم کە ناو و وێنەی رژنامەنووسە بە ئەزموونەکانیان بۆ دەزگای بەدرخان بنێرن هەر لە ئێستاوە. ئەوانەی کە وێنەیان بڵاونەبۆتەوە هیچ مەبەستێکی لە پشتەوە

نییە کەمی کات و دەست نەکەوتنی وێنـەکانیان بـووە بەتایبـەتی ڕۆژنامەنووسـەکانی (دەزگای ناوەنـدی ڕاگەیانـدنی پـارتی دیـموکراتی کوردسـتان و یـەکێتیی نیـشتیمانیی کوردستان و حزبەکانی دیکەتان.

## سەرچاوە

(١) لە ڕاستیدا بابەتەکەی بـەڕێز مومتـاز حەیـدەری لـە ژمـارە (٢١٦١)ی ڕۆژی ٢٠٠٦/٦/١ بوو، ئەو ژمارەو ڕۆژەی کە بەڕێز حەمید ئەبووبەکر ئامـاژەی پێکـردووە، هی بابەتەکەی بەڕێز فەرهاد عەونییە.

# سەد ساڵەی ڕۆژنامەنووسیی کوردی*

ئەگەر چینی و ڕۆمانی و میسرییە کۆنەکان لە سەدەکانی زۆر زووەوە جۆرێك لە ڕۆژنامەنووسییان داهێنابێ، ئەوا دوای دروستکردنی کاغەز و پاشتریش داهێنانی ئامێری چاپ لە ساڵی ١٤٤٥دا لەلایەن (گۆتەنبەرگ)ی ئەڵمانییەوە ئاسۆیەکی ڕووناك لەبەردەم زانست و ڕۆشنبیریدا کرایەوە و دەروازەیەکی گەورە والآکرا بۆ ئەوەی (ڕۆژنامە) بێتە مەیدان.

هەرچەندە ئەو وڵاتانەی کە بەشێکی کوردستانیان پێوە لکاوە هەتا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمین تیشکی ڕۆژنامەیان بەخۆیانەوە نەدیت، بۆ نموونە یەکەمین ڕۆژنامەی تورکی لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە لە ساڵی ١٨٣٢ دەرچوو، دوای ئەمە لە ئێرانیش لە سەردەمی ناسرەدین شادا لە ساڵی ١٨٥١ یەکەمین ڕۆژنامەی فارسی دەرچوو، سەبارەت بە عێراقیش یەکەمین ڕۆژنامە، کە ڕۆژنامەی (الزوراء) بوو، لە سەردەمی مەدحەت پاشا لە ساڵی ١٨٦٩ کەوتە بەر دیدی خوێنەران[1].

بەراوردکردنی کوردستانی بێ دەوڵەت لەگەڵ دەوڵەتە دراوسێکان ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ کە سەرەڕای بێ دەوڵەتی و هەژاری و بڵاوبوونەوەی نەخوێندەواری و خەریکبوونی زۆربەی زانا و شارەزایانی کورد بە ڕۆشنبیریی بیانی، لە ڕووی ڕۆژنامەنووسییەوە کوردستان هێندە دوانەکەوتووە، ئەوەتا لە ٢٢ی نیسانی ساڵی ١٨٩٨دا یەکەمین ژمارەی ڕۆژنامەی (کوردستان) لە میسر لەلایەن (میقداد مەدحەت بەدرخان)ەوە دەرچووە.

بەر لە دەرچوونی ڕۆژنامەی (کوردستان) ڕۆشنبیرانی کورد تاکە تاکە هەستیان بە گرنگیی ڕۆژنامە کردبوو، شاعیری نەتەوایەتیی کورد (حاجی قادری کۆیی) لەم ڕووەوە دەڵێ:

سەد قائیمە و قەسیدە کەس نایکڕێ بە پوولێ
ڕۆژنامەو و جەریدە کەوتۆتە قیمەت و شان

دیارە نەوەکانی بەدرخان پاشاش، بەتایبەتی میقداد مەدحەت و عەبدولڕەحمان و عەبدولڕەزاق، قوتابیی حاجی قادری کۆیی بوونە و پێوەندییەکی بەهێزی گیانییان لەگەڵدا هەبووە.

ڕۆژنامەی (کوردستان) لە سەردەمێکدا دەرچوو کە سەردەمی وریابوونەوەی نەتەوەکانی ژێر دەستەڵاتی ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی بوو، لەهەمان کاتیشدا زوڵم و زۆریی سوڵتان عەبدولحەمید گەیشتبووە رادەیەك کەم کەسی خاوەن هەڵوێست و هەستی نیشتیمانپەروەری بتوانێت لەناو دۆزەخی فەرمانڕەوایی سوڵتاندا بژی، بۆیە دەرچواندنی ڕۆژنامەیەکی سەربەخۆ بە زمانی کوردی لەژێر دەستەڵاتی ڕاستەوخۆی فەرمانڕەوایی سوڵتاندا کارێکی نەك هەر ئاسان نەبوو، بەڵکو بە هیچ کلۆجێك نەدەکرا، بۆیە میقداد مەدحەتی ڕۆژنامەنووس و دووربین کارێکی چاکی کرد کە (قاهیرە)ی پایتەختی میسری هەڵبژارد، چونکە میسری ئەوکاتە لەژێر فەرمانڕەوایی خدێوییەکانی میسردابوو، کە نەوەی محەمەد عەلی پاشای گەورە بوون و بە بنەچە کوردبوون. لە هەمان کاتدا هێز و دەستەڵاتی سوڵتانی نەدەگەیشتێ و ژمارەیەکی شیاویشی لە کورد تێدابوو بەتایبەتی قوتابییانی زانکۆی (الأزهر)، سەرەڕای ئەمانەش میسر پێش زۆربەی وڵاتانی دیکە ڕۆژنامەی لێ دەرچووبوو و بەهۆی داگیرکردنییەوە لەلایەن فەڕەنسا پێشکەوتنەکانی دوای شۆڕشی پیشەسازی کاری تێکردبوون.

لە سەروبەری دەرچوونی ڕۆژنامەی (کوردستان)دا چەند بنەمایەکی دیکەش هەبوون کە زەمینەی دەرچوواندنی ڕۆژنامەکەیان خۆشکردبوو، لەمانە خەباتی (تورکیای لاو) و جینۆسایدکردنی (ئەرمەن) و ڕۆڵی دیاری بنەماڵەی بەدرخانییەکان لە بواری ڕۆشنبیری و کوردایەتیدا.

یەکەمین ژمارەی ڕۆژنامەی (کوردستان) لە ڕۆژی پێنج شەممەی ٢٢ی نیسانی ساڵی ١٨٩٨دا دەرچوو. هەرچەندە ڕۆژنامەکە، ڕۆژنامەیەکی سەربەخۆ بووە و نوێنەرایەتیی هیچ کۆمەڵە و لایەن و حیزبێکی سیاسیی کوردی نەدەکرد، بەڵام

بەخێرایی شوێنی لەناو کورددا کردەوە و بووە دەربڕی ئایدیۆلۆژیای بزووتنەوەی کوردایەتی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا.

ڕۆژنامەی (کوردستان) لە سەرەتاوە بەناوی زانست و هاندانی کورد بۆ زانست و خوێندەواری خۆی بە خوێنەران ناساند، هەتا لە میسریش مایەوە ڕێڕەوە ڕۆشنبیرییەکەی زاڵبوو بەسەر لایەنی سیاسی و لایەنەکانی دیکەوە، بەڵام لە ژمارە (٦)ەوە کە لە میسر گوازرایەوە بۆ (جنێڤ) و عەبدولڕەحمان بەدرخانی برای میقداد مەدحەت سەرپەرشتیکردنی ڕۆژنامەکەی گرتە ئەستۆ، ڕێڕەوی ڕۆژنامەکە زیاتر بەرەو سیاسەت چوو و بەڕاشکاوی زوڵم و زۆری سوڵتانی دەستنیشان دەکرد و دژی فەسادی ئیداریی دەوڵەتی عوسمانی وتاری بڵاودەکردەوە، هەروەها دژی مژدەبەخشە ئەورووپاییەکان بوو کە دەهاتنە ناو دەوڵەتی عوسمانی بە کوردستانیشەوە و دەستیان لە کاروباری خەڵك وەردەدا.

دوای کوژاندنەوەی چرای (کوردستان) ڕۆژنامەنووسیی کوردی چەندینجار تووشی هەڵکشان و داکشان (مدو جزر) بووە، بەڵام لە ماوەی یەك سەدەی تەواودا کاروان هەر بەڕێوە و ڕێڕەو هەر بەردەوام بووە.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم بەم خشتەیەی خوارەوە مێژووی دەرچوونی یەکەمین ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردی لەم شوێنانە بخەینە بەرچاو:

| ناوی شوێن | یەکەمین ڕۆژنامە | یەکەمین گۆڤار |
|---|---|---|
| بەغدا | تێگەیشتنی ڕاستی ١٩١٨ | بانی کورد ١٩١٤ |
| سلێمانی | پێشکەوتن ١٩٢٠ | زانستی ١٩٣٨ |
| هەولێر | هەولێر ١٩٥٠ | ڕووناکی ١٩٣٥ |
| کەرکووك | ئازادی ١٩٥٩ | شەفەق ١٩٥٨ |
| ئەستەنبوڵ | کورد ١٩٠٨ | کوردستان ١٩١٩ |
| ئێران | کوردستان ١٩٤٦ | نیشتمان ١٩٤٢ |
| ئەورووپا | | کوردستان ١٩٥٨ |

دەتوانین قۆناغە زێڕینەکانی رۆژنامەنووسیی کوردی بەو چەند قۆناغە دەستنیشان بکەین، کە رۆژنامەنووسیی کوردی تێیدا لە هەلکشان دابووە و تارادەیەکی باش توانیوویەتی رۆلّی خۆی ببینێ:

١- قۆناغی سەردەمی فەرمانڕەوایی شێخ مەحموودی حەفید لە کوردستانی باشوور لە سالّی ١٩٢٢.

٢- سەردەمی فەرمانڕەوایی کۆماری مەهاباد لە کوردستانی رۆژهەلاّت لە سالّی ١٩٤٥.

٣- قۆناغی دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووز لە سالّی ١٩٥٨.

٤- قۆناغی دوای رێککەوتننامەی ١١ی ئاداری سالّی ١٩٧٠.

٥- قۆناغی دوای راپەڕینی بەهاری سالّی ١٩٩١.

هەرچەندە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی شێخ مەحموودی نەمردا تەنیا چوار رۆژنامە دەرچووە کە ئەمانەن:

١- رۆژنامەی (بانگی کوردستان).

٢- رۆژنامەی (رۆژی کورد).

٣- رۆژنامەی (بانگی حەق).

٤- رۆژنامەی (ئومێد ئیستیقلال).

بەلاّم دەرچوونی چوار ژمارە لە ماوەیەکی کەمتر لە سالّ و نیوێك و بە ئامێری سادە و کەلوپەلی سەرەتایی لە سەردەمە زووەداو بلاّوکردنەوەی بابەتی بەهێزی سیاسی و کۆمەلاّیەتی و رۆشنبیری، گرنگییەکی تایبەتی بەم قۆناغە دەدات.

سەبارەت بە قۆناغی سەردەمی کۆماری مەهابادیش، بەرپرسیارانی کۆمار توانییانە لە ماوەی نزیکەی سالێکدا ئەو رۆژنامە و گۆڤارانە پێشکەش بە نامەخانەی رۆژنامەنووسیی کوردی بکەن:

١- گۆڤاری (کوردستان) لە سالّی ١٩٤٥.

٢- گۆڤاری (هاواری کورد) لە ساڵی ١٩٤٥.

٣- گۆڤاری (ئاوات) لە ساڵی ١٩٤٥.

٤- رۆژنامەی (کوردستان) لە ساڵی ١٩٤٦.

٥- گۆڤاری (هەڵاڵە) لە ساڵی ١٩٤٦.

٦- گۆڤاری (هاواری نیشتیمان) لە ساڵی ١٩٤٦.

٧- گۆڤاری (گڕوگاڵی منداڵانی کورد) لە ساڵی ١٩٤٦.

قۆناغی دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨یش یەکێکە لە قۆناغە زێڕین و گەشەدارەکانی رۆژنامەنووسیی کوردی، لەم قۆناغەدا ژمارەیەکی زۆر رۆژنامە و گۆڤار دەرچوون. لە سیما دیارەکانی ئەم قۆناغە، دەرچوونی رۆژنامەی حزبی بوو بە شێوەیەکی رەسمی، دوای ئەوەی پێشتر حزبەکان لە بڵاوکراوەی نهێنی بەم لاوە هیچی دیکەیان نەبوو، ئەوەبوو لەم قۆناغەدا رۆژنامەی (خەبات) لەلایەن پارتی دیموکرای کوردستان لە مانگی نیسانی ساڵی ١٩٥٩ دەرچوو، دوای ئەمیش بە ماوەیەکی کەم لە ١ی ئایاری هەمان ساڵدا رۆژنامەی (ئازادی) لەلایەن حزبی شیوعیی عێراق-لقی کوردستان دەرچوو.

بەڵام ئەو قۆناغە گەشەدارەش هێندە بەردەوام نەبوو و کەوتە کزی و دەنگی ئازادیخوازان کپکرایەوە، بەتایبەتی دوای هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئەیلوولی ساڵی ١٩٦١ رۆژنامەنووسیی کوردی لە کوردستانی خوارووی گەرموگوڕیی جارانی نەما، بۆیە رۆژنامەنووسیی نهێنی جارێکی دیکەش کەوتەوە جموجۆڵ و رۆڵی خۆی بینی لە هوشیارکردنەوەی جەماوەر و ئاراستەکردنیان.

دوای رێککەوتننامەی ١١ی ئاداری ساڵی ١٩٧٠ جارێکی دیکەش رۆژنامەنووسیی کوردی لە کوردستانی خوارووی هەڵکشانێکی دیکەی بەخۆیەوە بینی و چەندین رۆژنامە و گۆڤار لەلایەن حکوومەت و حیزبە سیاسییەکان و رێکخراوە جەماوەری و پیشەییەکانەوە دەرچوو، ئەوەبوو لەم قۆناغەدا بۆ یەکەمینجار لە مێژووی رۆژنامەنووسیی کوردیدا رۆژنامەیەکی رۆژانە دەرچوو، ئەویش رژنامەی

(برایەتی) بوو، کە ژمارە (سفر)ی لە رۆژی سێ شەممەی ١ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٤ دەرچوو، دوا ژمارەیشی، کە ژمارە (٢٦) بوو لە رۆژی پێنج شەممەی ٧ی مانگی شوباتی هەمان ساڵدا دەرچوو.

ئەم قۆناغە لە چوار ساڵ زیاتر بەردەوام نەبوو، بەهۆی تەنگژەی نێوان سەرکردایەتیی شۆڕش و رژێمی عێراق و دەستپێکردنەوەی شەڕ لە ئاداری ١٩٧٤ ئەو قۆناغە کەوتەوە کزی.

دەتوانین رۆژنامەنووسیی کوردی لە ساڵی ١٩٧٤ هەتا راپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ بکەین بە سێ بەش:

١- ئەو رۆژنامە و بڵاوکراوانەی لەلایەن حزبە کوردستانییەکانی ناوەوە و دەرەوەی بەرەی کوردستانی کە لە شاخ دەردەچوون.

٢- رۆژنامە و گۆڤارەکانی رژێم کە لەلایەن دامودەزگا رۆشنبیرییەکانییەوە دەردەچوون.

٣- ئەو بڵاوکراوانەی کە لەلایەن حزبە کوردستانییەکانی بەشەکانی دیکەی کوردستان دەردەچوون.

دوای راپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١یش رۆژنامەنووسیی کوردی وەرچەرخانێکی گەورەی بەخۆیەوە بینی، ئەوەبوو شاڵاوی رۆژنامە و گۆڤار و بڵاوکراوەی کوردی هێندە بە گوڕ و ژمارەیان ئەوەندە زۆربوو، دەتوانین بێ سڵەمینەوە قۆناغی دوای راپەڕین بە گەشەدارترین قۆناغەکانی رۆژنامەنووسیی کوردی دابنێین.

لە سیما هەرە دیارەکانی ئەو قۆناغەش زۆربوونی رۆژنامەی حزبییە، مەبەستی سەرەکیش لە دەرچوواندنی رۆژنامەی حزبی، خزمەتکردنی ئامانجەکانی حزبەکەیە ئینجا ئامانجە نەتەوەییەکانی دوور لە قالبی حزبایەتی، رووداوەکانی دوای دەستپێکردنی شەڕی ناوخۆش بە تەواوی ئەو راستییەیان سەلماند، بەتایبەتی رۆژنامەی ئەو حزبانەی کە راستەوخۆ لە شەڕی ناوخۆدا هاوبەشییان کرد.

ئەو قۆناغە، جگە لە زۆریی ژمارەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان، ئازادییەکی تارادەیەك باشیش لەبەردەم ڕۆژنامەنووسیدا ڕەخسا، بەتایبەتی پێش دەستپێکردنی شەڕی ناوخۆ، بەڵام لە ئەنجامی بەردەوامبوونی شەڕ و دابەشکردنی هەرێمی کوردستانی ئازادکراو بۆ دوو بەشی سەر بە دوو فەرمانڕەوایی جیاواز، بەربەستێك لە بەردەم ئازادیی ڕۆژنامەنووسیدا دروستکرا.

شایانی باسە لە دوای ڕاپەڕینەوە حزبە سیاسییەکانی بەشەکانی دیکەی کوردستانیش لە بواری ڕۆژنامەنووسیدا ڕۆڵیان هەبووە و ژمارەیەك ڕۆژنامە و گۆڤار و بڵاوکراوەی کوردییان دەرکردووە.

هیوادارین لە ڕۆژی یەکەمی سەدەی دووەمی تەمەنی ڕۆژنامەنووسیی کوردییەوە بەربەست و تەنگژەکان نەمێنن و ڕۆژنامە بەڕاستی ببێتە دەسەڵاتی چوارەم و چاودێر بەسەر هەڵسوکەوت و کردەوەی ناهەموار و ڕۆژنامەنووسان بێ سڵەمینەوە و ڕێگە لە بەردەم گرتن، بتوانن ئەرك و پەیامی ڕۆژنامەنووسییان بە تەواوی جێبەجێ بکەن و سانسۆر لەسەر قسەی حەق و نووسینی پاك و قەڵەمی نەترس و بابەتی سوودبەخش نەمێنێ.

## سەرچاوە

* لە گۆڤاری (سەنتەری برایەتی) ژمارە (٥)ی ٢٢ی نیسانی ساڵی ١٩٩٨ بڵاوکراوەتەوە.

(١) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، تێگەیشتنی راستی و شوێنی لە رۆژنامەنووسیی کوردیدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٨، ل٣١، ٤٦، ٤٧.

# گۆڤارێکی منداڵان بە شێوازێکی تایبەت*

بوونی زمانێکی یەکگرتووی ئەدەبی یەکێکە لە ئاواتە نەتەوەییە دێرینەکانی دڵسۆز و خەمخۆرانی وشەی کوردی و پێویستە هەموو لایەکمان هەوڵی هێنانەدی بدەین و کۆسپ و تەگەرە و بەربەستەکانی لەبەردەم لابەرین و دەستخۆشی و پشتگیریش لە هەموو ئەو هەوڵانە بکەین کە دەیانەوێت هەردوو شێوەزارە سەرەکییەکەی کوردستان لە یەکتر نزیکبکەنەوە.. ئاخر چی لەوە ناخۆشتر هەیە تۆ لەکاتی گفتوگۆکردن لەگەڵ هاوزمانێکتدا پێویستیت بە وەرگێڕێك هەبێت، یان هەوڵبدەیت بە زمانێکی بیانی لەگەڵ هاوزمانێکی خۆت بپەیڤی؟!

گۆڤاری (پەنات)ی منداڵان بۆ ئەوە دەردەچێت تاکو درزی گەورەی نێوان هەردوو شێوەزارەکە بچووك بکاتەوە و وابکات منداڵانی هەردوولا هەر لە سەرەتای ژیانیاندا ئاشنای شێوەزاری یەکتربن، نەك وەکو دوو زمانی جیاواز سەیری هەردوو شێوەزارەکە بکەن.

سەرەتای گەڵاڵەکردنی بیرۆکەی دەرکردنی گۆڤاری (پەنات) بۆ سەرەتای ساڵی ٢٠٠٨ دەگەڕێتەوە، کە رۆژێکیان سەیدا (جەعفەر مایی) شارەزا لە وەزارەتی کاروباری کۆمەڵایەتیی هەرێمی کوردستان سەردانی نووسینگەی گۆڤاری (هەنگ)ی منداڵانی کرد لە هەولێر و رایگەیاند کە بە مەبەستی ئاشناکردنی منداڵانی کورد بە هەردوو شێوەزارە سەرەکییەکە، بیری لە دەرکردنی گۆڤارێکی منداڵان کردووەتەوە کە هەردوو شێوەزارەکە وەکویەك بەخۆیەوە بگرێت، دیارە ئەم کارە گەورەیە و بەو شێوەیەی کە مەبەستە یەك لایەنە ناکرێت، چونکە ئێستا نە لە هەولێر و نە لە دهۆك و نە لە هیچ شارێکی دیکەی هەرێمی کوردستاندا ئەو ستافە رۆژنامەنووسە

کارامە و لێهاتووەی بواری منداڵان نییە کە بتوانن گۆڤارێکی سەرکەوتووی منداڵان بە هەردوو شێوەزارەکە دەربکەن و بەردەوامیش بن، بۆیە پێشنیازی ئەو وابوو کە بۆ ئەو مەبەستە دوو گۆڤاری سەرکەوتووی منداڵان هەڵبژێرێ، کە یەکێکیان بە کرمانجی خواروو و ئەوی دیکەیان بە کرمانجی سەروو بێت، هەروەها گوتیشی ئەو پێی باشە کە ئەو دوو گۆڤارە گۆڤاری (هەنگ) و (سڤۆرە)بن، هەروەکو بەڕێزیشی رایگەیاند کە ئەو لەم بارەیەوە قسەی لەگەڵ سەرنووسەر و بەرپرسانی گۆڤاری (سڤۆرە)دا کردووە و ئەوانیش بیرۆکەکەیان پێ باش بووە. ئێمەش لە گۆڤاری (هەنگ)[1] دا هەر لەسەرەتاوە بیرۆکەی ئەم پرۆژەیەمان پەسند کرد و بە هەنگاوێکی باشمانزانی بۆ زیاتر لەیەك تێگەیشتنی منداڵانی هەردوو دەڤەرو لە ئەنجامدا پێگەیاندنی نەوەیەك کە هەردوو شێوەزارەکە بەهی خۆیان بزانن و بەیەك چاو سەیری بکەن و ئامادەیی خۆمان دەربڕی کە بە هەموو توانایەك هاوکارییان بکەین بەمەرجێك:

١- لەبەر ئەوەی گۆڤاری (هەنگ) گۆڤاری وەزارەتی رۆشنبیرییە و وەزیری رۆشنبیری خۆی خاوەنی ئیمتیازی گۆڤارەکەیە، بۆیە پێویستە بە نووسین رەزامەندیی جەنابی وەزیر وەربگیرێ.

٢- دەرچوونی هەر ژمارەیەکی گۆڤاری (پەنات) بەلای کەمییەوە مانگێك دوای دەرچوونی ئەو ژمارەیەی گۆڤاری (هەنگ) بێت کە بابەتەکانی دەخرێنە ناو لاپەڕەکانی گۆڤارەکەوە.

٣- هەموو مافە مەعنەوییەکانی گۆڤاری (هەنگ) پارێزراو بێت و ناوی دەستەی بەڕێوەبردنی گۆڤارەکە و نووسەر و وێنەکێشی بابەتەکان چۆن لە گۆڤاری (هەنگ)دا هاتووە، بە هەمان شێوە لای ئەمانیش بنووسرێ و ئاماژەش بە ژمارەی گۆڤارەکە بکرێ.

ئێستاش دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی باش و بە هەوڵ و تەقەلایەکی زۆری سەیدا (جەعفەر مایی) و هاوکارانی، توانرا لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٨دا یەکەم ژمارەی

گۆڤارەکە دەربچێت، کە گۆڤاری (پەنات)ە. (پەنات) کورتکراوەی دەستەواژەی (پەپوولە ناتوند و تیژەکان)ەو بڕیار وایە ساڵی (٩) ژمارەی لێدەربچێت.

کارمەندانی گۆڤاری (پەنات) بریتین لە: خاوەنی ئیمتیاز/ جەعفەر مایی، سەرنووسەر/ ئومێد ئەنوەر، دەرهێنانی هونەری/ محەمەد مەلا حەمدی و مەسعوود خالید گوڵی.

ئەو ژمارەیەی گۆڤاری (پەنات) (٥٢) لاپەڕەی جوان و ڕەنگاوڕەنگە کە (٢٠) لاپەڕەی لە ژمارە (١٤٠)ی گۆڤاری (هەنگ) وەرگیراوە و (١٩) لاپەڕەیشی لە گۆڤاری (سڤورە) و (١٣) لاپەڕەش تایبەتە بە گۆڤارەکە خۆی، لەنێو ئەو (١٣) لاپەڕەیەی گۆڤارەکەدا هەردوو بەرگەکەیەتی، کە بەرگی یەکەمی لەلایەن هونەرمەندی دەست ڕەنگین (ئەحمەد بێری)یەوە کراوە، ئەویش وێنەی کچ و کوڕێکی کوردن و کەسایەتیی (شەنگێ و شەنگۆ)ی پێداون. دوا بەرگیشی دەستکردی قوتابی (سەگڤان خالید)ە لە قوتابخانەی (کنێر)ی بنەڕەتیی لە دهۆك، کە ژنێکی کوردە بە پنە و ساج نان دەکات.

ئێمە لە کاتێکدا پیرۆزبایی لە منداڵانی کوردستان و دەستخۆشیش لە هەڵسووڕێنەرانی گۆڤاری (پەنات) دەکەین، پێمان باشە لە ژمارەکانی داهاتوودا ئەم چەند خاڵە بە هەند وەربگیرێ:

١- ژمارەیەکی شیاوی بدرێتە کتێبخانەکان، بۆ ئەوەی بە ئاسانی بگاتە دەستی منداڵان، نەك تەنیا هەر بۆ هاوبەشەکان بێت، هەروەکو لە ژمارە (١)دا واپێڕەو کراوە.

٢- نرخەکەی کەم بکرێتەوە، چونکە ٣٠٠٠ دینار بۆ منداڵ زۆرە.

٣- ئاماژە بە ژمارە و مانگی دەرچوونی هەردوو ژمارەی گۆڤاری (هەنگ) و (سڤۆرە) بکرێ، کە بابەتەکانی دەخرێنە ناو هەر ژمارەیەکی گۆڤاری (پەنات)ەوە.

## سەرچاوە

* لە رۆژنامەی (خەبات) ژمارە (٣١١٥)ی رۆژی یەکشەممەی ٨ی ئاداری ساڵی ٢٠٠٩دا بڵاوکراوەتەوە.

(١) نووسەری ئەم بابەتە سەرنووسەری گۆڤاری (هەنگ) بوو.

# نەورۆز لە هەفتەنامەیەکی دوورگەی (گوام)*دا

دوورگەی (گوام) دوورگەیەکە دەکەوێتە ناو ئۆقیانووسی (هێمن) لە نێوان یابان و ئوسترالیادا.

ئەو دوورگەیە سەر بە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە و پایتەختەکەیشی (تیجان)ە. لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٦دا نزیکەی (٦٥٠٠) کوردی پەناهەندەی کوردستانی عێراقی بۆ ماوەی نزیکەی چوار مانگ لێ مایەوە و پاشان رەوانەی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کران.

هەفتەنامەی (پاسفیك هاڤن) هەفتەنامەیەك بوو لە ماوەی ئەم چوار مانگەدا بە رەزامەندیی سەرکردەی هێزە هاوبەشەکانی کرداری (پاسڤیك هاڤن) دەرچووە و لەسەریشی نووسراوە کە بڵاوکراوەیەکی رەسمی نییە و بە هیچ جۆرێك دەربڕینی رای رەسمیی حکوومەتی ئەمەریکا نییە.

هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی ئەم هەفتەنامەیە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە زۆربەی بابەتەکانی بە زمانی عەرەبین و کەمێکیشی بە ئینگلیزی، بەڵام لە ژمارە (١٤)ی رۆژی ١٩٩٧/٣/٢١دا، کە رۆژی نەورۆزە، یەکەمین بابەتی ئەو ژمارەیەی هەفتەنامەکە بە زمانی کوردییە و لەبارەی جەژنی نەورۆزەوەیە. هەرچەندە بابەتەکە تەنیا نیو لاپەڕەی هەفتەنامەکەی گرتووەتەوە و شتێکی نوێی ئاواشی تێدا نییە کە مایەی سەرنجراکێشان بێت، بەڵام بڵاوکردنەوەی بابەتێکی ئاوا بە زمانی کوردی و لە بارەی جەژنێکی نەتەوەیی کوردەوە لە بڵاوکراوەیەکی دوور لە کوردستان، شتێکی دڵخۆشکەرە و شایانی ئەوەیە خوێنەری کورد و توێژەرانی بواری رۆژنامەنووسیی کوردی لێ ئاگادار بکرێتەوە.

لێرەدا دەقی بابەتەکە وەکو خۆی و بێ دەستکاری بڵاودەکەینەوە، هەرچەندە هەندێك هەڵەی زمانەوانی و چاپەمەنیشی تێدایە، بەڵام خوێنەر خۆی دەتوانێت بە ئاسانی هەڵەکان دەستنیشان بکات. ئەمەش دەقی بابەتەکەیە:

## نەورۆزمان پیرۆز بێت

نەورۆز.. جەژنی نەتەوەیی کوردە- رێکەوتی (٢١)ی مانگی ئازارە. دادەنرێ بە یەکەم رۆژی ساڵی کوردی، ئەم ساڵ دەبێتە (٢٦٩٧)ی کوردی، مێژووی دامەزراندنی دەوڵەتی (میدی)یە، کە دەکاتە (٧٠٠) ساڵ پێش دەستپێکردنی مێژووی زایینی، وە رۆژێکی زیندووە لە ژیانی کورددا.

نەورۆز.. (یەکەم) رۆژی بەهارە کە کوردستان خۆی دەنوێنی بە بەرگی سەوزی چنراو بە گوڵی رنگاورنگی گوڵاڵە سوورەو نێرگزی بوون خۆش لە دەشت و دۆڵ قەدپاڵی چیا بڵندەکان. نەورۆز نیشانەی سەرکەوتن و نەمانی زۆرداری و شۆرشێکی پڕ لە ئاواتی رزگاری و ئازادییە، بەدەستە پۆلایینەکە و چەکوشە مێژوویەکەی رۆڵەی کورد (کاوە)ی ئاسنگەر بۆ سەری پاشای مێشك خۆری منالی کورد (زووحاك).

نەتەوەی کورد بەخۆشییەوە یادی (نەورۆز) دەکاتەوە و ئاهەنگی بۆ دەگێرێ و جل و بەرگی میللی لەبەر دەکەن و دەشت و دۆڵی کوردستان دەرازێنێتەوە بە جلی رەنگاو رەنگ و سروود و گۆرانی و هەڵپەرکێی میللی.

نەورۆز بڵێسەی ئاگرەکەی نیشانەی سەرکەوتنی خواوەندی خێرە (ئەهور ئەمز)ە بەسەر خواوەندی شەڕ (ئەهریمەن)، بەپێی ئایینی (زەردەشتی)، ئایینی کۆنی کورد، پێش راگەیاندنی ئایینی (ئیسلام). جگە لە کورد چەند میللەتێکی تر لەو ناوچەیەدا وەك فارس و ئازەر ئاهەنگ دەگێرن بەم بۆنەیەوە.

نووسەرو شاعیر و هونەرمەندانی کورد پێنووس و فلچەکانیان بۆ نەورۆزی کورد تەرخانکردووە و چەندین سروود و تابلۆ و گۆرانی پڕ لە هەستی نەتەوایەتی پێشکەش بە نەورۆز کردووە.

با نەورۆزی ئەم ساڵمان یاد بکەینەوە، بە یادێکی پڕ لە هەستی برایەتی و خۆشەویستی و ئاشتی بۆ هەمووان.

پیرۆز بێت... جەژنی نەورۆزی کورد لە هەمووان(١).

## سەرچاوە

* لە گۆڤاری (رامان) ژمارە (٥٦)ی رێککەوتی ٥ی شوباتی ٢٠٠١دا بڵاوکراوەتەوە، ل٢٨٤.

(١) ئەندازیار (عەبدولڕەزاق فەرهادی)ی برام، کە یەکێك بوو لە پەناهەندەکانی دوورگەی گوام و پاشان لە ئەمەریکا نیشتەجێ بوو، ئەو ژمارەیەی بڵاوکراوەکەی بۆ ناردم. سوپاسی دەکەم.

# تیۆری رۆژنامەنووسی* خوێندنەوە و هەڵسەنگاندن

ئەگەر یەکەمین رۆژنامەی کوردی لە ساڵی ١٨٩٨دا دەرچووبێت، ئەوا یەکەمین کتێبی تایبەت بە رۆژنامەنووسیی کوردی تاکو (٧٢) ساڵ دوای ئەم مێژووە دەرنەچووە، ئەوەبوو لەو ساڵەدا (١٩٧٠) کتێبی (مێژووی رۆژنامەگەری کوردی) لەلایەن نووسەری شەهید (عەبدولجەبار محەمەد جەباری) وەکو یەکەمین کتێبی تایبەت بە رۆژنامەنووسیی کوردی بڵاوکرایەوە و لەو ساوەش هەتا ئێستا ناو بەناو کتێبی تایبەت بەم بابەتە رۆشنبیرییە گرنگە دەکەوێتە بەردەستی خوێنەران.

یەکێك لەو کتێبە گرنگانەی کە لە ساڵی (٢٠٠٠)دا لەبارەی رۆژنامەنووسیی کوردییەوە بڵاوکراوەتەوە کتێبی (تیۆری رۆژنامەنووسی)یە.

ئەو کتێبە، کە (١٩٩) لاپەڕەی بەخۆوە گرتووە، لەلایەن نووسەری دوورە وڵات کاك (مەگدید سەپان)ەوە نووسراوە و لە (ستۆکهۆڵم)ی پایتەختی (سوید) چاپکراوە.

ئەوەی زیاتر بووە هاندەر بۆ ئەوەی ئەم نووسینەی بۆ تەرخانبکرێ، ئەم سێ خاڵە سەرەکییە بوو:

١- کتێبەکە یەکێکە لەو کتێبە بە نرخ و تۆکمانەی کە چەندین زانیاریی پوختەی سەبارەت بە تیۆری رۆژنامەنووسی و رۆژنامەنووسیی کوردییەوە تێدا بڵاوکراوەتەوە.

٢- کتێبەکە لە دەرەوەی کوردستان چاپکراوە و تەنیا (٥٠٠) دانەی لێ بڵاوکراوەتەوە، دیارە لەم (٥٠٠) دانەیەش ژمارەیەکی کەمی گەیشتووەتە کوردستان و زۆربەی هەرە زۆری خوێنەرو رۆژنامەنووسان نەیانبینیوە.

٣- نووسەری کتێبەکە یەکێکە لە پسپۆڕانی بواری رۆژنامەنووسی، خۆی لەم بارەیەوە دەڵێ: (ئەم کتێبە لە ئەنجامی خوێندنی پێنج ساڵ لە فاکولتێتی

ڕۆژنامەگەری زانکۆی سانکت پیتربۆرگ، سێ ساڵ خوێندنی دکتۆرا لە هەمان فاکولتێت، دە ساڵ کارکردنم لە چاپخانە، لەوە حەوت ساڵ ١٩٧٦-١٩٨٣ لە چاپخانەی کوردستان، زیاد لە دوو ساڵ دەرکردنی ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ بە زمانی ڕووسی، جگە لە خوێندن و کارکردن لە چاپخانە، سوودم لە زۆر سەرچاوە بەر زمانی کوردی، عەرەبی، سویدی، ڕووسی وەرگرتییە)[١].

نووسەر مەبەستی خۆی لە دانانی کتێبەکە بەم شێوەیە ڕوون کردووەتەوە: (لە نووسینی ئەم کتێبەمدا ئەو مەبەستانەی خوارەوەم هەبوو:

یەك: بۆ ئەوەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانمان بەشێوەیەکی باشتر دەربچن، نووسینەکان کەمتر هەڵەی تەکنیکی و زمانەوانی تێدابێ.

دوو: بۆ ئەو کەسانەی ڕۆژنامەنووس نین، بەڵام جار بەجار گوتار دەنووسن، بۆیان وەك ڕێگا نیشاندەرێك بێ.

سێ: بەو هیوایەی ئەو کتێبە سوودی بۆ خوێندکارانی بەشی ڕۆژنامەگەری هەولێر و سلێمانی هەبێ.

چوار: بۆ خوێندکارانی زانکۆ لەگەڵ ئەو کەسانەی ئارەزوویان لە خوێندنەوەی کتێب لەسەر تیۆری ڕۆژنامەگەری هەیە.

بۆ هەموو ئەوانەی سەرەوە، لەگەڵ هەموو خوێنەرێك، هیوادارم سوودی هەبێ)[٢].

نووسەر لەسەرەتای پێشەکییە (١٢) لاپەڕەییەکەدا لەبارەی ڕۆژنامەنووسی و دەستەڵاتی چوارەم دەڵێ: (ڕۆژنامەگەری لە کۆمەڵدا بە چوارەمین دەستەڵات دادەنرێت ئەو بۆچوونە ڕای هەموو ئەو زانایانەیە کە لەسەر ڕۆژنامەنووسی لێکۆڵینەوەیان کردووە. بە ڕای منیش ڕاگەیاندن لە کۆمەڵدا چوارەمین دەستەڵاتە، بەڵام لەنێو کۆمەڵ و دەوڵەتێکی ئازاد و دیموکراتدا. لە دەوڵەتانی دیکتاتۆر و دواکەوتوو، یان لە قۆناغی گۆڕینی سیستێم و شەڕی نێوخۆ، تەنیا یەك دەستەڵات هەیە، ئەویش دەستەڵاتی چەکە)[٣].

پاشان لە درێژەپێدانی پێشەکییەکەیدا، بەڕای خۆی، هۆیەکانی درەنگ دەرکردنی ڕۆژنامەنووسیی کوردی بۆ ئەم سێ هۆیە سەرەکییانە دەگەڕێنێتەوە:

١- بێ هێزیی هەستی کوردایەتی.

٢- شاعیر و رۆشنبیران پلە و پایەی چاکیان لە حکوومەتی مەرکەزی پێدراوە و نەیانویستووە ئەو ژیانە خۆشە لە خۆیان تێکبدەن.

٣- دواکەتوویی و نەخوێندەواریی گەلی کورد.

دوای ئەمە دێتە سەر دابەشکردنی رۆژنامەنووسیی کوردی، ئەو رۆژنامە نووسیی کوردی بەسەر پێنج قۆناغ دابەش کردووە:

١- رۆژنامەگەریی سەردەمی ئازاد: مەبەستی نووسەر لەم قۆناغەدا رۆژنامە و گۆڤارەکانی سەردەمی حوکمدارێتیی شێخ مەحموودی حەفید و کۆماری مەهاباد و رۆژنامە ناحزبی و ئازادەکانی ئەو سەردەمەن، کەچی ناوی هیچ کام لەم رۆژنامە و گۆڤارانەی نەهێناوە کە لەو سەردەمەیدا دەرچووینە، تەنیا ئاماژەی بەوە کردووە کە لە بیستەکانی سەدەی رابردوودا حەوت رۆژنامە و گۆڤار لە ماوەی هەشت ساڵدا دەرچوون و لە سەردەمی کۆماری مەهابادیشدا شەش گۆڤارو رۆژنامە.

سەبارەت بە چاپەمەنییە ناحیزبی و ئازادەکانیش نموونەی بەو رۆژنامە و گۆڤارانە هێناوەتەوە کە خوالێخۆشبووان حوسێن حوزنی موکریانی و گیوی موکریانی و پیرەمێرد و ئیبراهیم ئەحمەد دەریانکردووە.

نووسەر ناوی کۆمەڵێك نووسەری هێناوە کە لەم سەردەمەیدا رۆڵیان لە رۆژنامەنووسیی کوردیدا هەبووە. ئەو نووسەرانەی کە ناویان هاتووە هەندێکیان بەڕاستی رۆڵیان هەبووە، وەکو: رەفیق حیلمی، پیرەمێرد، حوسێن حوزنی، عەلائەدین سجادی و چەندی دیکەش، بەڵام هەندێك لەو نووسەرانەی باسی کردوون ئەو رۆڵەیان نەبووە، بەڵکو تەنیا بە نووسین بەشدارییان کردووە، وەکو: محەمەد ئەمین زەکی بەگ، تۆفیق وەهبی و شێخ محەمەدی خاڵ.

٢- رۆژنامەگەریی پارت و حزبە سیاسییەکان: لەم بارەیەوە ناوی ئەو حزب و لایەنانەی هێناوە کە رۆڵیان لە رۆژنامەنووسیی کوردیدا هەبووە.

٣- ڕۆژنامەگەریی شاخ: باسی ڕۆڵی ڕۆژنامەنووسیی شاخی کردووە لە سەرەتای هەشتاکانەوە تاکو ڕاپەڕین، بێ ئەوەی ئاماژە بۆ چاپەمەنییەکانی سەردەمی شۆڕشی ئەیلوول بکات!

٤- ڕۆژنامەگەریی دەرەوەی وڵات: مەبەست لەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەن کە لە دەرەوەی کوردستان دەرچووینە.

نووسەر تایبەتتمەندییەکانی ڕۆژنامە نووسیی دەرەوەی وڵاتی بەم خاڵانە دەستنیشان کردووە:

أ- نووسەرەکانیان ئازادانەتر بیریان کردووەتەوە.

ب- گەشترین سەردەمی ئەو بەشە دوای ناوەڕاستی هەشتاکان بوو.

پ- لە یەك ژمارەی هەر بڵاوکراوەیەکدا چەند بیروبۆچوونی جیاجیا بەرچاو دەکەون.

ج- لەناو ئەو گۆڤارانەدا زۆر ڕەخنە لەسەرکردە و حزبە سیاسییەکانی کوردگیراوە.

چ- هەندێك لەو گۆڤارانە ڕۆڵی مامۆستایان بینیوە لە دانانی نەخشە و پلان بۆ پارتە سیاسییەکانی کوردستان.

د- وەکو پێویست نەیانتوانیوە ڕووداوەکانی کوردستان بە شێوەیەکی بێ لایەن و ڕاست و دروست بە خوێنەران بگەیەنن.

بەڕای من خاڵی (٢ و ٣ و ٤) کە نووسەر هەر یەکەیانی بە قۆناغێکی تایبەتیی ڕۆژنامەنووسیی کوردی داناوە، قۆناغ نین، بەڵکو جۆرێکن لە جۆرەکانی ڕۆژنامەنووسیی کوردی.

٥- ڕۆژنامەگەریی دوای ڕاپەڕین: لەبارەی ڕۆڵی ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا لە سەردەمی داوی ڕاپەڕین کاك مەگدید دەڵێ: (بۆ یەکەمجار کورد توانی دوو ڕۆژنامەی ڕۆژانە لەگەڵ دەیان گۆڤار و چەندین کەناڵی تەلەفزیۆنی و وێستگەی ڕادیۆی هەبێ. ئەوەندەی کورد لەم دە ساڵەی دوایی توانی کتاب و گۆڤارو ڕۆژنامە بە چاپ بگەیێنێ، بە هەموو مێژووی نەتەوەی خۆی ئەوەندەی دەرنەکردووە. ئەم هەموو گۆڤارو

ڕۆژنامانـه، ئەگەرچـی زۆربـەیان ئۆرگـانی حیـزب و ڕێکخراوەکـانن، لەگـەڵ ئەوەشـدا ناتوانرێ ڕۆڵیان لە پێشخستنی ئەدەب و ڕۆژنامەگەریی کوردی پشتگوێ بخرێ)[٤].

نووسەری بەڕێز لە پێشەکییەکەیدا داکۆکیی لەسەر ئەوە کـردووە کـە بـەپێی توانـا هەوڵیداوە وەکو بێ لایەنێك و دوور لە سیاسەت تەنیا باس لـە تیـۆری ڕۆژنامەنووسـی بکات و ناوی کەس بەخراپە نـەهێنێ و کـەس نەشـکێنێتەوە. بـەڕای مـن تاڕادەیـەکی باش ئەو خالانەی ڕەچاوکردووە، بەلام تۆ بلێیی ١٠٠٪ ئەوەی پێ کرابێ؟! باوەڕ ناکەم!

❊ ❊ ❊

(هەواڵ) یەکـەمین بابـەتی کتێبەکەیـە کـە لاپـەڕە (١٩-٣٥)ی بـۆ تـەرخانکراوە، نووسەر لە سەرەتای ئەم بابەتەدا بە کورتی باسی هـەواڵ دەکـات و دەڵـێ: (هـەواڵ لـە ژانەرە کۆنەکانی ڕۆژنامەنووسییە و شێوەی گەیاندنی ڕووداوێك وەئەستۆ دەگرێ کە لە ناوەوەی ولات، یان لە دەرەوەی، ئەمڕۆ یا دوێنێ ڕوویدابێ)[٥].

لەبارەی هەواڵ لـە ڕۆژنامـە کوردییەکانیـشدا دەڵـێ: (لـە یەکـەمین ڕۆژنامـەی کوردی بەناوی «کوردستان» لەلایەن میقداد مەدحەت بەردخان لە قـاهیرە دەرچـوو بایەخی تایبەتی بە هەواڵ دراوە. لە ژمارەی یەکەمی کە لە ٢٢ی نیـسانی ١٨٩٨ لە قاهیرە بلاوکرایەوە، بەدرخان باس لە شەڕی بەینی میسرو سودان بۆ خوێنـەرانی ڕۆژنامەکەی دەکا. دەتوانین بلێین لە مێژووی ڕۆژنامەگـەری کوردیـشدا، هـەواڵ لـە ژانەرە هەرە کۆنەکانە)[٦].

نووسەر زیاتر لەسەر باسەکەی دەڕواو دەڵێ: (ئەگەرچی کورد زیاد لە سەد ساڵ ئەزموونی نووسینی هـەواڵی بـەزمانی زگمـاکی هەیـە، کەچـی تـا ئـەمڕۆش، کـەم هـەواڵ، بەڕاسـتی و دروسـتی ((مەبەسـت لـە داڕشـتنی هەواڵـە)) لـە ڕۆژنامـە و گۆڤارەکان بلاودەکرێنەوە.

لەکاتی خوێندنەوەی ڕۆژنامەکانی کوردی بەتایبەتی ((برایـەتی)) و ((کوردسـتانی نوێ)) زۆرجار خوێنەر هەندێك هەواڵی بۆ دەبێتە مەتەڵ و نازانێ قسەکان، ڕووداوەکان

کەی و لە کویێ روویانداوە؟ یان کراون!. پێویست ناکا نموونە بهێنمەوە، چونکە لە هەموو ژمارەکان بە ئاسانی ئەم کەموکورتییانە بەرچاو دەکەون!)[٧].

نووسەری کتێبی تیۆری رۆژنامەنووسی هەواڵی رۆژنامە کوردییەکان دابەشی سەر دوو بەش دەکات:

١- کورتە هەواڵ.

٢- هەواڵی درێژ.

سەبارەت بە کورتە هەواڵ دەڵێ: (بەگوێرەی تیۆری رۆژنامەنووسی، نووسینی کورتە هەواڵ دەبێ وەڵامی سێ پرسیار بداتەوە: چی روویداوە، لە کوێندەر روویداوە، کەی روویداوە.

کورتە هەواڵ لە نووسین لە چەند دێرێک تێپەڕ ناکاو رۆژنامەنووس ناتوانێ بیروبۆچوونی خۆی تێدا باس بکا. بەبڕوای رۆژنامەنووسی سویدی سۆران لارسۆن کورتە هەواڵ چاکە لە ٣٠-٤٠ وشە تێپەڕ نەکا، بەڵام بە بۆچوونی ئەو باشترە بە ٣٠ وشە کۆتایی پێ بهێندرێ).

بەڵام بۆ هەواڵی درێژ دەڵێ: (هەواڵی درێژ دەکرێ ١٠-١٥ خەت لە ئەستوونێکدا داگیربکا. لێرەدا رۆژنامەنووس جگە لەوەی راستیی رووداوەکە دەنووسێ، دەتوانێ هۆی رووداوەکەش لەگەڵ ئەنجامی بۆ خوێنەران بنووسێ...).

(هەواڵی درێژ بۆ ئەوەی لە کورتە هەواڵ جیابکرێتەوە، دەبێ وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە درابنەوە. چ روویداوە؟ کەی روویداوە؟ کێ تێدا بەشدارە؟ چۆن روویداوە؟ لە کێندەر روویداوە؟ لەبەرچی؟...)[٨].

لە بارەی هەواڵ لە رۆژنامە حزبییەکانیشدا دەڵێ: (لە رۆژنامەکانی حزبیدا، هەواڵ بەگشتی و هەموو نێوەرۆکی رۆژنامەکەش بەتایبەتی، لە بەرژەوەندی حزب دایە... لە خزمەت و پڕوپاگەندەکردن بۆ حزبەکان دایە. بۆیە ئەوانەی لە رۆژنامەکانیش کاردەکەن، یان ئەندامی ئەو حیزبەن، یان دۆستی نزیکی حیزبەکەن، ئەمەش لە زۆرکاتدا دەکاتە خنکاندنی وشە)[٩].

بەڵام بۆ هەواڵ لە دەوڵەتانی پێشکەوتوو و دیموکرات دەڵێ: (هەواڵ لە دەوڵەتانی پێشکەوتوو و دیموکرات، بەلایەن و بێ لایەنی نییە. ڕۆژنامەنووسان باس لە ڕووداوەکە دەکەن کە چۆن ڕوویداوە. خەڵك ناشپرسن، ئایا دەبێ کابرا سەر بە چ پارت و ڕێکخراوێك بێ؟ بۆیە لەم دەوڵەتانە، هەواڵ بریتییە لە نووسینی چەند دێڕێك، کە ڕۆژنامەنووس دەینووسێ و دەیەوێ بەهۆی ڕۆژنامەکەیەوە بەخوێنەرانی بگەیەنێ)[10].

لەبارەی دووبارەبوونەوەی هەواڵیش دەڵێ: (ڕووداو هەیە یەك ڕۆژ لە ڕۆژنامەکان لەسەری دەنووسرێ، هەیە چەند مانگێك بەردەوام لەسەری دەنووسرێ، ئەمەش بەپێی گەورەیی و زەقیی ڕووداوەکەیە. گرتنی سەرۆکی پ. ك. ك. عەبدوڵڵا ئۆجەلان زیاد لە مانگێك بووە هەواڵی سەرەکیی ڕاگەیاندنی زۆربەی دەوڵەتانی ئەورووپای ڕۆژئاوا، بەڵام گرتنی سەرۆك کۆماری هایتی لە چەند ڕۆژێکی زیاتر نەخایاند)[11].

هەر لەبارەی هەواڵەوە نووسەر دێتە سەر باسی هەواڵ لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکانی کوردستان، باسی ئەوە دەکات کە هەواڵ لەم دوو کەناڵەی ڕاگەیاندندا چۆن و بە چ شێوەیەك بڵاودەکرێتەوە: (لە کوردستان ڕۆژنامەی ((برایەتی)) و ((کوردستانی نوێ)) مۆنۆپۆلی زۆربەی هەواڵەکانیان بەدەستەوەیە. ڕۆژنامەنووسانی ڕادیۆ، چاوەڕێ دەکەن کە ڕۆژنامە دەربچێ، ئینجا بۆ ڕۆژی دوایی باس لە ڕووداوەکان دەکەن)[12].

نووسەر زیاتر لەسەری دەڕوا، پاشان دەپرسێ و دەڵێ: (من ئێستاش تێنەگەیشتم کە بۆ دەبێ پاش ٢٤ سەعات خەڵك لەم هەواڵانە ئاگاداربکرێنەوە؟ لەکاتێکدا بەتایبەتی ڕادیۆکان، لەم پێشبڕکێیەدا لەگەڵ ڕۆژنامە زۆر بەئاسانی دەیانتوانی گرەوەکە ببەنەوە!).

پاشان هەر خۆی وەڵامی پرسیارەکە دەداتەوە و دەڵێ: (ئەمن لەم کارە تەنها بیرم بۆ دوو شت دەچوو:

یەك: نەبوونی ئازادی ڕۆژنامەنووسی.

دوو: ئەو کادیرە سیاسییانەی ڕادیۆکانیان بەڕێوەدەبرد، فریان بەسەر ڕۆژنامەنووسییەوە نەبوو.

چونکە کە کورد ئەزموونی سەد ساڵەی بەڕێوەبردن و دەرکردنی ڕۆژنامەی هەیە، تەمەنی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن ئەوەندە زۆر نییە! دوور نییە ئەوەش هۆیەك بێ بۆ درەنگ باسکردن و گەیاندنی ڕووداوەکان)[١٣].

دواشت لەبارەی هەواڵەوە کاك مەگدید ئەوەیشی ڕاگەیاندووە کە (هەواڵ دەبێ ڕاست بێ و دووربێ لە درۆ. ئەگەر ڕۆژنامەیەك هەواڵێکی بێ بەڵگەو ناڕاستی بڵاوکردەوە، بەهۆی دەستوور و یاساوە ڕۆژنامەکە دەکرێ بە دادگا بدرێ. ئەمە ڕووداوێکی نوێ نییە لە مێژووی ڕۆژنامەگەری جیهان. بۆیە زۆرجار لە نووسین خراپ نییە بزانرێ لە چ سەرچاوەیەك ئەو هەواڵە وەرگیراوە)[١٤].

* * *

دووەم بابەتی کتێبی (تیۆری ڕۆژنامەنووسی) تایبەتە بە (گوتار).. نووسەر لەبارەی وتارەوە دەڵێ: (گوتار لە ژانەوە گرنگەکانی ڕۆژنامە و گۆڤارە، ڕۆژنامەنووس یان نووسەری گوتار، بە تێری لەسەر بابەتێکی دیاریکراو دەنووسێ. لە گوتار نووسیندا ڕۆژنامەنووس بە دوور و درێژی کێشە و فاکتەکان دەخاتە ڕوو و بەباشی شیاندەکاتەوە.

گوتار لە شێوە و داڕشتندا، لە هەواڵ و ریپۆرتاژ دەچێ. مەبەست لە گوتار شیکردنەوەی پرسیارێکە کە نووسەر دەتوانێ بەهۆی ئەو فاکتانەی دەستی کەوتوون بەوردی، بۆ خوێنەران ڕوونی بکاتەوە)[١٥].

پاشان دێتە سەر لقەکانی گوتار: کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسی، مێژوو، ئەدەب، ڕەخنە، وەرزش، مێدیسین، ئایین..هتد.

ئینجا تایبەتمەندییەکانی گوتاری زانستی بەم پێنج خاڵانە دەستنیشان دەکات:

١- بەگشتی خەڵکی ئەکادیم یان زۆر شارەزا لە بابەتێکی دیاریکراودا دەیاننووسێ.

٢- ناوی ئەو سەرچاوانەی تێدا دەنووسرێ کە نووسەر لەکاتی نووسینی گوتارەکەیدا بەکاری هێناون و سوودی لێوەرگرتوون.

٣- به قەبارە زۆرترە، گوتاری زانستی زۆرجار ٢٠-٣٠ لاپەڕەی گۆڤار دەگرێ.

٤- گوتاری زانستی زۆرتر بۆ گۆڤار دەنووسرێ تا بۆ رۆژنامە.

٥- زمانی نووسینی گوتاری زانستی، لەگەڵ زمانی رۆژنامە جیایە[١٦].

لەبارەی گوتار لە رۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکانیشدا دەڵێ: (ئەگەر بە وردی رۆژنامە و گۆڤارەکانی کوردی بخوێنینەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە ژانەری گوتار لە هەموو شێوەکانیتری رۆژنامەنووسی، زۆرتر بەکارهاتووە. ئەزموونی زۆری نووسەرانی کورد لەسەر ئەم ژانەرە و شێوەی بەرزکردنەوەی پرسیار، دەتوانم بڵێم لە هەموو ژانەرەکانیتر، نووسەران زۆرتر سەرکەوتنیان تێدا بەدەستهێناوە.

رۆژنامەنووس دەبێ لەکاتی نووسینی گوتار زۆر وشیاربێ، تا لەگەڵ شێوەکانیتری نووسین وەك: ریپۆرتاژ یان هەواڵ لێی تێکنەچێ. چونکە لە ریپۆرتاژ رۆژنامەنووس شایەدی رووداوەکانە، لە نووسینی گوتاریش زۆرجار رۆژنامەنووس هەمان دەوری هەیە، بەڵام جیاوازی بنەڕەتی لە شێوەی دەربڕینی بیر و دارشتن هەیە، ئەگەر مرۆڤ پسپۆڕ نەبێ، بە دوورمەزانە زۆرجار لە بەینی ئەم دوو ژانەرە لەکاتی نووسین یان خوێندنەوە لێی تێکەڵاو دەبێ)[١٧].

دوای ئەمە نووسەر نموونەی بە گوتارەکانی حوسێن حوزنی موکریانی هێناوەتەوە کە لە گۆڤاری (رووناکی) ١٩٣٥-١٩٣٦دا بڵاوی کردوونەتەوە.

* * *

سێیەم بابەتی کتێبەکە تایبەتە بە (چاوپێکەوتن) یان (دیدار)، کە نووسەر وشەی (ئینتەرڤیو)ی ئینگلیزی بۆ بەکارهێناوە. ئەم بابەتە لاپەڕە (٤٩-٧٤) ی کتێبەکەی گرتووەتەوە.

نووسەر لەبارەی ئەو ژانەرە گرنگەی رۆژنامەنووسییەوە دەڵێ: (ئینتەرڤیو وەك ژانەرێکی سەربەخۆی رۆژنامەنووسی، لە ١٧٠٠ لە رۆژنامە و گۆڤارەکانی بەریتانیا سەریهەڵدا. ئەو ژانەرە لەو کاتەدا زیاتر لە دادگاکان و پۆلیسخانەکان سوودی

لێوەردەگیرا. حاکم و پۆلیس پرسیاریان لە کابرای تاوانبارکراو دەکرد و وەڵامی پێویستیان دەستدەکەوت. پرسیار و وەڵامی حاکم و تاوانبار بۆ خوێنەران وەك خۆی بڵاودەکرایەوە. لەو کاتە هێشتا رۆژنامەنووسان پرسیاری خۆیان لە کابرای تاوانبار نەدەکرد، بەڵکو رۆژنامەنووس بەوە رازی بوو کە پرسیاری حاکم لەگەڵ وەڵامی تاوانبار بخاتە سەر کاغەز... ئەم ژانەرە زەقتر لە رۆژنامەکانی نیویۆرك لە ناوەڕاستی ١٨٣٠ بایەخی پێدرا، بەڵام وەك ژانەرێکی رۆژنامەنووسی لە سەردەمی شەڕی نێوخۆی ئەمەریکا ١٨٦١-١٨٦٥ شوێن پێیخۆی گرت. لە کیشوەری ئەوروپا لە دەوڵەتی فەڕەنسا بۆ یەکەمجار لە ١٨٧٠-١٨٧١ بایەخی تەواوی پێدرا. ئەم مێژووە بۆ زۆربەی دەوڵەتانی پێشکەوتووی ئەورووپا دەتوانین بە سەرهەڵدانی ئەو ژانەرەی رۆژنامەنووسی لە قەڵەم بدەین)[١٨].

سەبارەت بەسەرهەڵدانی ئینتەرڤیو لە رۆژنامەنووسیی کوردیشدا دەڵێ: (ئەگەر سەیری گۆڤارو رۆژنامە کوردییەکان بکەین، بۆمان دەردەکەوێ کە لە مێژووی رۆژنامەگەری کوردی ئەم شێوە ژانەرە زۆر درەنگ لەسەر لاپەڕەی گۆڤار و رۆژنامەکان بەدیارکەوت. ((ئەو گۆڤار و رۆژنامانەی کوردی کوردستان، رۆژا کورد، رۆژی کوردستان، بانگی کوردستان، رووناکی، گەلاوێژ، ژمارەکانی ساڵی ١٩٤٣، کوردستان، هەولێر، هەتاو، کە من دەستم کەوتوون و لێکۆڵینەوەم لەسەریان کردووە)) ئەم ژانەرەیان تەواو پشتگوێ خستبوو)[١٩].

پاشان نووسەر گلەیی لەوە دەکات کە ئەوانەی خەریکی دەرکردنی گۆڤار و رۆژنامەکان بووینە، جگە لە زمانی زگماکی خۆیان زمانەکانی دەوروپشتیشیان زانیوە، کەم تا زۆر شارەزاییشیان لە زمانێکی ئەوروپاییدا هەبووە و ئەو ژانەرەیان لە رۆژنامەکانی ئەواندا بەرچاو کەوتووە، کەچی لە رۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکاندا پشتگوێیان خستووە.

بۆ چۆنیەتیی خۆئامادەکردن و شێوەی پرسیارکردنی رۆژنامەنووسیش دەڵێ: (رۆژنامەنووس چاکە پلانی ئینتەرڤیوەکە لەگەڵ پرسیارە گرنگەکان لەسەر

کاغەزێك بنووسێتەوە، بەڵام تا بۆی بلوێ لەکاتی ئینتەرڤیو وەرگرتن، چاکە سەیریان نەکا، یان زۆر کەم سەیریان بکا، چونکە بە سەیرکردن، دوورنییە، لەپێش قارەمانی نووسینەکە سووك بێ و ئەو بە رۆژنامەنووسێکی چاك و سەرکەوتووی لە قەڵەم نەدا. ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی کابرا بیەوێ زوو خۆی لەدەست رۆژنامەنووس رزگار بکا. زۆریش گرنگە رۆژنامەنووس کابرای بەرامبەر بە پرسیارکردن بۆردوومان نەکا، یانی کابرا وەڵامی پرسیاری یەکەمی بە تەواوی نەداوەتەوە، پرسیاری دووەمی پێشکەش بکا)[٢٠].

پاشان زیاتر لەسەری دەڕواو دەڵێ: (بۆ رۆژنامەنووس زۆر گرنگە، بە وردی گوێ لە قسەکانی کابرا رابگرێ. ئەو گوێگرتنە بۆ رۆژنامەنووس گوێگرتنی وەك مرۆڤێکی ئاسایی نییە، بەڵکو نیشاندانە بە گرنگی قسە و بیروڕای کابرا)[٢١].

لەبارەی دەستپاکیی رۆژنامەنووسیش لەکاتی وەرگرتنی ئینتەرڤیودا دەڵێ: (لە وەرگرتنی ئینتەرڤیو لەگەڵ هەر کەسێك بێ، رۆژنامەنووس دەبێ پێش هەموو شتێك دەستپاك بێ، وەڵامەکان نەشێوێنێ. رۆژنامەنووس ئەگەرچی مافی هەیە بە گوێرەی بیرو پێویستی خۆی وەڵامەکان گوڵبژێر بکا، بەڵام نەك درۆخستنە پاڵی و سووککردنی قارەمانەکەی! چونکە ئەوەی ئەو دەینووسێ، بۆ خۆی نییە و هەزاران کەسیتر دەیخوێنێتەوە)[٢٢].

بۆ شێوەی ئاراستەکردنی پرسیارەکانی ئینتەرڤیوش دەڵێ: (رۆژنامەنووس لەکاتی پرسیارکردن، پێش هەموو شتێك دەبێ زۆر بڕوای بەخۆی هەبێ و خۆی لاواز نیشان نەدا). پرسیارکردن چاکە بەدەنگێکی سروشتی بێ نەك بە هاتوهاوار، ئەمەش بۆ ئەوەی لەکاتی ئینتەرڤیو وەرگرتندا قارەمانەکەی لەبیر بکا کە ئەو قسە بۆ رۆژنامەنووس دەکا، لەم کاتەدا گفتوگۆکە مۆری سروشتی بەخۆیەوە دەگرێ.

ئەگەر پرسیاری توند بێنە پێشەوە کە بزانێ ئەوەی بەرامبەری پێیان تووڕە دەبێ، چاکە پرسیارەکان لە شێوەی کەسی سێیەمەوە بن. بۆ نموونە: برادەرێکم دەیگوت، تۆ دەستەڵاتت بۆ کاری تایبەتیی خۆت و خزم و کەس و کارت بەکاردەهێنی، نەك بۆ

خزمەتکردنی جەماوەر؟ نازانم ئەو برادەرەم راست دەکا یان نا؟ ئەگەر ئەو لێرە بووایە تۆ چۆن وەڵامت دەدایەوە؟ لە کاتی وەڵامدانەوەی دەتوانیٚ لەسەر هەمان بابەت بەردەوام بیٚ و پرسیاری تری لیٚ بکریٚ وەك: پێش ئەوەی بێمە ئێرە چوومە زانکۆ و لەگەڵ خوێندکاران و مامۆستایان قسەم کرد، کەسیان لە کارەکانی ئێوە رازی نەبوون! تەنانەت زۆریان پێکەنینیان دەهات کە گوایە ئێوە شایەنی ئەو کورسییە نین، کە ئێستا لەسەری دانیشتوون! دەبیٚ ئەوان لەسەر چی وا نارازی بن؟ خەڵك ئەم هەموو قسانە لە کویٚ دەهێنیٚ؟

ئەم شێوە پرسیارانە لەبەر ئەوەی لە شێوەی کەسی سێیەمەوە دەکرێن، قارەمانی ئینتەرڤیوەکە بە هیچ شێوەیەك تووڕە ناکا و هەڵیش ناچیٚ لەکاتی وەڵامدانەوەیان. لەکاتێکدا دەکریٚ رۆژنامەنووس هەمان بیروبۆچوونی رەخنەگرانی هەبیٚ! بەم تەکنیکە رۆژنامەنووس دەتوانیٚ زانیاری زۆرتری دەستبکەویٚ، بەمەش خوێنەران باشتر رازی دەبن)[٢٣].

* * *

(نووسینی رێپۆرتاژ، باسکردنی رووداوێکە کە رۆژنامەنووس لەگەڵ خەڵکیتر تێیدا بەشدارە. ئەو ریپۆرتاژ بۆ خوێنەرانی رۆژنامە یان گۆڤار دەنووسیٚ، یانیش بۆ رادیۆ یان تەلەفزیۆن ئامادەی دەکا. ژانەری رێپۆرتاژ زۆرتر لەلایەن رۆژنامەنووسانی ئەمەریکی و بەریتانی فۆڕمی نوێی ئێستای بەخۆوە بینیوە. ئەوان تەکنیکی نووسینی رێپۆرتاژیان بەرەو پێشەوە برد و بایەخی زۆریان پێدا).

بەم جۆرە کاك مەگدید سەپان دەروازەی باسەکەی لەبارەی (رێپۆرتاژ)ەوە دەکاتەوە. پاشان لە درێژەپێدانی باسەکەیدا کە لاپەڕە (٧٥-٩٢)ی کتێبەکەی بۆ تەرخانکردووە، دەڵیٚ: (رێپۆرتاژ بۆ رۆژنامە و گۆڤار لەلایەن خوێنەرانەوە، وەك نیشانی فلیمی رووداوەکانە کە لە تەلەفزیۆن بۆ بینەران پیشاندەدریٚ. بە خوێندنەوەی ریپۆرتاژ، خوێنەر شارەزای تەواوی رووداوەکان دەبیٚ، لەگەڵ ئەوەشدا مەرج نییە نووسینی هەموو ریپۆرتاژەکان وەك یەك دەستپێبکەن و تەواوبن.

ڕێپۆرتاژی چاك و سەرنجڕاكێش لەسەر بنچینەی زانیاری تەواو لەسەر بابەتێكی دیاركراو دەنووسرێ. ڕۆژنامەنووس دەبێ دەستپاك بێ و تەواو شارەزابێ لەو بابەتەی لەسەری دەنووسێ...

(لەكاتی نووسینی ڕێپۆرتاژ زۆر گرنگە وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوەی تێدابێ: كێ تێیدا بەشدارە؟ لە كێندەر ڕوویداوە؟ كەی ڕوویداوە؟ چ ڕوویداوە؟... جگە لەو چوار پرسیارەی سەرەوە، دوو پرسیاری تریش هەن وەك: چۆن ڕوویداوە؟ لەبەرچی ڕوویداوە؟ زۆرجار وەڵامی ئەم دوو پرسیارەی دواوە بۆ بەهێزكردنی نووسینەكان گرنگن)(٢٤).

لەبارەی ئەو زمانەی كە ڕێپۆرتاژی پێ دەنووسرێ و ئایا ڕۆژنامە كوردییەكانی خۆمان تا چ رادەیەك بایەخیان پێیداوە دەڵێ: (ڕێپۆرتاژ دەبێ بە زمانێكی ئەدەبیی زۆر جوان و لە هەمانكاتیشدا ئاسان، كە هەموو خوێنەران تێیبگەن، بنووسێ. بەگشتی لە نووسین بۆ ڕۆژنامە، دەبێ زمانێكی ئاسان بەكاربهێنرێ «لە هەردوو ڕۆژنامەی كوردی برایەتی و كوردستانی نوێ، ئەم شێوە نووسینە تا ئێستا پەیڕەو نەكراوە». زۆربەی كات گوتارو نووسینەكان لە بڵاوكراوەی ناوەخۆی حیزبی دەكەن، تا ڕۆژنامەی سەردەم)(٢٥).

نووسەر گرنگیی ڕێپۆرتاژی بەوە دەستنیشان كردووە كە تا چ رادەیەك بەڕاستگۆیی نووسراوە: (گرنگیی ڕێپۆرتاژ ئەوەیە كە شوێنی درۆ و دەلەسەی تێدا نابێتەوە، چونكە لەو كاتەدا نووسینەكە نابێ بە ڕێپۆرتاژ. هەموو نووسینەكە دەبێ هەڵێنجراوی ئەو ڕاستییانە بن كە ڕۆژنامەنووس، بە چاوی خۆی بینیوویەتی. بۆیە ڕێپۆرتاژ ڕەنگدانەوەی ڕووداوەكانە كە یەك لە بەشداربووانی ڕۆژنامەنووس خۆیەتی)(٢٦).

دوای ئەمە نووسەر دێتە سەر باسی مێژووی سەرهەڵدانی ڕێپۆرتاژ لە ڕۆژنامەو گۆڤارە كوردییەكاندا و دەڵێ: (یەكەمین ریپۆرتاژ) لەو ڕۆژنامە و گۆڤارە كوردییانەی من دەستم كەوتوون و لێكۆڵینەوەم لە سەریان كردووە، تەنیا لە ڕۆژنامەی ڕۆژی كوردستان، ژمارە هەشت، ساڵی ١٩٢٢ بووە. لەم ڕێپۆتاژە ڕۆژنامەنووس بە دوور و

درێژی باس لە سەردانەکەی سمکۆ ئاغای شکاك، بۆبینی مەلیکی کوردستان شێخ مەحموودی جەفید دەکا. نووسەر توانیویەتی وەستایانە بینینەکانی سمکۆ ئاغا بە خوێنەر رابگەیەنێ. خوێنەر لەکاتی خوێندنەوەی، هەستدەکا کە خۆی بەشداره لە بینینەکان. ئەم رێپۆرتاژە ئەگەرچی لە ساڵی ١٩٢٢ نووسراوه، لەگەڵ ئەوەشدا، زانیارییەکی تەواو لە سەردان و رووداوی ناوبراو بە خوێنەران دەدا.

نووسینی ریپۆرتاژ لە یەکەمین رۆژنامەی کوردی (کوردستان) شوێنی نەبۆتەوە. لە رۆژنامەی (رۆژی کورد) (زۆربەی نووسەرانی کورد کە لەمەڕ رۆژنامەکانی کوردییان نووسیوە، گۆڤاری رۆژی کورد کە لە ساڵی ١٩١٣ لە ئەستەمبوڵ سێ ژمارەی لێدەرچووە، بە رۆژنامە ناوی دەبەن. بەڕای من زیاتر لە گۆڤار دەکا، تا رۆژنامە، ئەمەش چ لەبەر درێژیی گوتارەکانی رۆژی کورد، چ لە ژمارەی زۆری لاپەڕەکان و قەبارە)یشی شوێنی نەبۆتەوە. بۆیە بە دوور نازانرێ، هاتنەکەی سمکۆ ئاغای شکاك بۆ سلێمانی و سەردانی مەلیکی یەکەمی کوردستان، بە یەکەمین رێپۆرتاژ لە مێژووی رۆژنامەگەریی کوردی لە قەڵەم بدرێ)[٢٧].

* * *

لاپەڕە (٩٣-١٠٢)ی کتێبی (تیۆری رۆژنامەنووسی) بۆ (نووسین) تەرخانکراوە.. نووسەر لەو باوەڕەدایە کە نووسین بۆ رۆژنامە دەبێ ئاسان بێ و هەموو کەس تێبیگات: (نووسین بۆ رۆژنامە دەبێ بەجۆرێك بنووسرێ کە هەموو کەسێك لەکاتی خوێندنەوەی بە ئاسانی تێی بگات، چونکە رۆژنامەنووس مەبەستی لە نووسین، گەیاندنی هەواڵێکە، رووداوێکە، یان بیروبۆچوونێکە بۆ خوێنەران)[٢٨].

لەبارەی نووسین لە هەردوو رۆژنامەی رۆژانەی کوردستان ((برایەتی و کوردستانی نوێ)) دەڵێ: (ئەمن نازانم ئایا کەس لەو دوو رۆژنامە کوردییانەی کوردستان بە نووسینەکان دادەچنەوە، یان نا؟ ئەگەر تا ئێستاش کەس لەم جۆرە پسپۆڕانە کار لەو دوو رۆژنامانە نەکەن، درەنگ نییە بیری لێبکەنەوە! ئەگینا دەبێتە کاری سەرنووسەر، ئەگەر لەکاتێکدا سەرنووسەر بەسەر ئەم گرفتانە

نەتوانێ زاڵببێ، مانەوەی لەم کارەی بە زیانی ڕۆژنامە دەگەڕێتەوە. بە دووریش نازانرێ ببێتە هۆی شێواندنی زمانی کوردی!)[٢٩].

شایانی باسە نووسەر لەم رووەوە نموونەی زیندووشی هێناوەتەوە.

نووسەر لە درێژەپێدانی هەمان بابەتدا ئەوەشی راگەیاندووە کە سەرنووسەر بۆی هەیە بابەتە لاوازەکان سەرلەنوێ دابڕێژێتەوە بێ ئەوەی دەستکاری لە ناوەڕۆکی نووسینەکە بکات: (سەرنووسەر بۆی هەیە سەرلەنوێ نووسینەکە دابڕێژێتەوە، کورتی بکاتەوە، بەڵام ناتوانێ دەستکاری لە نێوەڕۆکی نووسین، بە مەبەستی ئاڵۆزکردنی گوتارەکە بکا. ئەمە دەبێتە هەڵەی گەورە و تایبەتە بە ئەخلاقی ڕۆژنامەنووسی.

لە کوردستان لەبەر ئەوەی ڕۆژنامەنووسی چاك و پسپۆڕ کەمن، بۆیە دەستەڵاتی سەرنووسەر لەوانەیە کەمێك زۆرتربێ. ئەوەی ئێمە دەینووسین مەبەستمان لە ڕۆژنامەنووسی بە گشتییە نەك هەر لە کوردستان)[٣٠].

لە کۆتایی ئەو باسەی کە نووسەری کتێبەکە بۆ (نووسین)ی تەرخانکردووە، دەڵێ: (ڕۆژنامەنووس هەرچەند زۆرتر خۆی بە نووسینی دروست خەریك بکاو بایەخی پێبدا، ڕۆژنامەکەی زۆرتر بەرەو پێشەوە دەچێ و خوێنەری زۆرتری دەبێ. ئێمە قەت ناتوانین بیر لە دەرکردنی ڕۆژنامەیەك بێ نووسین بکەینەوە، کە دەشنووسین، دیارە بۆ خوێنەرانە. بۆ ئەوەی ڕێزی زۆرتر لە خۆمان و خوێنەران بگرین، دەبێ زۆرتر بایەخ بە نووسین و ناوەڕۆکەکەی بدەین. ئەگەر بەم شێوەیەی سەرەوە کاربکەین، بێ شك دەبینە خاوەنی چاکترین ڕۆژنامە کە زۆرترین خوێنەری دەبێ)[٣١].

* * *

لاپەڕە (١٠٣-١٢١)ی کتێبی (تیۆری ڕۆژنامەنووسی) بۆ (ڕەسم لە ڕۆژنامە) تەرخانکراوە.

نووسەر لە سەرەتای بابەتەکەیدا مێژووی سەرهەڵدانی کامیراو چۆنیەتیی پێشکەوتنی بۆ خوێنەر روون دەکاتەوە، پاشان دێتە سەر دروستبوونی فلیمی دەکۆمێنتی، ئینجا باسی وێنەی ڕۆژنامەنووسی دەکات.

لە باسی گرنگیی وێنە لە ڕۆژنامەنووسیدا دەڵێ: (وێنە ئاوێنەی ڕووداوەکانە. ڕۆژنامەنووس کە وێنە لەگەڵ نووسینەکەی بەکاردەهێنێ، بۆ ئەوەی فاکتەرەکانی بەهێزتر بێ و هەوڵدەدا واقیعی ڕووداوەکە وەك خۆی بگەیەنێتە خوێنەران. هەربۆیەش لە لاپەڕەی یەکەمی هەموو ڕۆژنامەیەك، وێنەیەکی گەورە بڵاوکراوەتەوە، کە دەکاتە گەورەترین ڕووداوی ژمارەی ناوبراو. لە ڕۆژنامەکانی دەوڵەتانی ڕۆژئاوا، لەژێر هەموو ڕسمێك، جگە لەوەی ناوی کابرای فۆتۆگراف یان ئاژانس دەنووسرێ، کۆمێنتاری ڕۆژنامەنووسیش، بەقەد بڵاوکردنەوەی وێنەکە کار دەکاتە سەر خوێنەران. کۆمێنتار دەکرێ چەند وشەیەك بن، یان چەند ڕستەیەك)[٣٢].

هەر لەبارەی گرنگیی وێنە لە ڕۆژنامەنووسیدا دەڵێ: (هەندێك ڕسم هەن بینەران قەت ناتوانن لەبیری بکەن، ئەو جۆرە وێنانە ئەگەر لەکاتی شەڕگیرابن، بوونەتە سیمبولی (ڕەمزی) شەڕەکە. من بۆ ئەوەی مەبەستم چاکتر بۆ خوێنەران ڕوون بکەمەوە، بەپێویستم زانی دوو نموونە بهێنمەوە:

یەك: هەموو تراژیدیای هەڵەبجە، یەك وێنە بۆتە ڕەمزی، ئەویش پیرەمێردێکە کە منداڵی بە باوەشەوەیە و هەردووکیان لە وێنەکە دیارن وەك ئەوەی خەویان لێکەوتبێ، لەم وێنەیە دوو کەس تراژیدیای پێنج هەزار شەهید نیشاندەدا. وێنەی ناوبراو ئەوەندە کار دەکاتە سەر بینەر، کە ناتوانێ لە بیری بچێ، ئەگەر لە کاتێکدا لە بیریشی چووبێ، لەکاتی بینینی وێنەکە یەکسەر دەزانی هی چ تراژیدیایەکە. بەڕای من ئەو وێنەیە نەك هەر سیمبولی تراژیدیای هەڵەبجەیە بۆ کورد، بەڵکو تراژیدیای هەموو گەلانی کوردستان لەناو ئەو وێنەیەدا دەبینرێ.

دوو: بەڕێوەبەری پۆلیس بەناوی، نگوییێن نگوس لۆوان، بەندییەك لە شاری سایگۆن لە ساڵی ١٩٦٨ دەکوژێ. هەردوو وێنە کاریان زۆر لە جەماوەرکردووە و هەردووکیشیان لەلایەن فۆتۆگرافی پسپۆڕەوە گیراون)[٣٣].

نووسەری کتێبەکە لەبارەی وێنە لە ڕۆژنامە کوردییەکانیشدا دەڵێ: (لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی کوردی، تائێستا وێنە بایەخی خۆی پێنەدراوە و شوێنی خۆی لە ڕۆژنامە

و گۆڤارەکان نەکردۆتەوە. زۆرجار ئەو وێنانەی لەگەڵ ماتریالەکان بڵاوکراونەتەوە، چاکتربوو بڵاونەکراباناوە، چونکە ئەگەرچی نووسینەکە باش بووە، بەڵام وێنەکە گیانی لەبەربردووە و خوێنەری لە خوێندنەوەی دوورخستۆتەوە)[٣٤].

❊ ❊ ❊

(سەردێر یان ناوی گوتار) بابەتێکی دیکەی کتێبەکەیە کە لاپەڕە (١٢٣-١٢٩)ی بۆ تەرخانکراوە، نووسەر لە بارەی گرنگیی سەردێڕ دەڵێ: (هەموو نووسین و بڵاوکراوەیەك لە رۆژنامە و گۆڤاردا، بەهۆی سەردێڕەوە دەناسرێتەوە. سەروتار دەکاتە کلیل یان کۆدی نووسین، کە خوێنەر بۆخۆیان رادەکێشن. لەبەر ئەوەی رۆژنامەکانی سەردەم لاپەڕەیان یەکجار زۆرە، زۆرجار لە ٦٠-٧٠ لاپەڕە تێپەڕ دەکا، خوێنەر بەگشتی ناتوانێ هەموو رۆژنامەکە بخوێنێتەوە، بەڵام دوور نییە سەیری هەموو لاپەڕەکانیش بکاو لە هەر لاپەڕەش هەموو سەردێڕەکان بخوێنێتەوە.

سەردێڕ ئەگەر قسەی بکردایە، بە خوێنەری دەگوت: گوتارەکەشم بخوێنەوە! بۆیە هەر سەردێڕیشە خوێنەر بڕیاری لەسەر دەدا، ئایا ئەم نووسینە شایەنی خوێندنەوەیە یان نا؟)[٣٥].

لەبارەی چۆنیەتی نووسینی سەردێڕیش دەڵێ: (لە نووسینی سەردێڕدا رۆژنامەنووس هەن، دوای نووسینی گوتارەکە ناونیشان بۆ نووسینەکەیان دیاردەکەن، هەر لە سەرەتادا ناو بۆ نووسینەکەی دادەنێ، ئینجا دەست بە نووسینی گوتارەکەی دەکا. بەڵام ئەوەی تا ئێستا زۆرتر باوە، ئەوا شێوەی یەکەمە. گوتار دەنووسرێ، ئینجا ناونیشانی بۆ هەڵدەبژێردرێ)[٣٦].

❊ ❊ ❊

(ئەخلاق لە راگەیاندندا) دوا بەشی کتێبەکەیە، جگە لە سەرچاوە و پاشکۆ. ئەو باسە لاپەڕە (١٣١-١٤١)ی بۆ تەرخانکراوە. نووسەر لەم بارەیەوە دەڵێ: (جەماوەر بەگشتی و رۆژنامەنووس بەتایبەتی، لەناو هەموو کۆمەڵگایەکدا، چالاکیی رۆژانەی

خۆیان لە چوارچێوەی یاساو دابونەریتی ئەو کۆمەڵەی تێیدا دەژین، ئەنجامدەدەن. بۆیە یاساکان و دابونەریت و دیانەتە ئاسمانییەکان، لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێك دەگۆڕێن. ناشتوانین بڵێین یاسای فلانە دەوڵەت بۆ فلانە کۆمەڵ دەگونجێ. بۆ نموونە یاسای دەوڵەتی سوید و دابونەریتی گەلی سوید بەگشتی تایبەتە بۆ دەوڵەت و دانیشتووانی سوید. هەر لە سویدیش دەتوانرێ وەکو پێویست، سوودی لێ وەربگیرێ. ئێمە ناتوانین تەواوی یاساو دابونەریتی سوید کۆپی بکەین و لە کوردستان جێبەجێی بکەین، چونکە ئەو شتانەی بۆ سویدییەکان گرنگن، کورد لەوانەیە هەر بایەخیان پێنەدا، یانیش تەواو بەپێچەوانەوە.

لە باسکردنی ئەوانەی سەرەوە، مەبەستمان هەموو لایەنێکی ژیان نییە. هەندێك کاری خراپ هەن کە لە هەموو شوێنێکدا بەتاوان لە قەڵەم دەدرێن، نموونە: دزی، کوشتن، سووککردنی خەڵك، شەڕ...هتد.

ئەگەرچی ئەوانەی سەرەوە هەموویان، لە هەموو شوێنێك و لەنێو هەموو کۆمەڵگایەك بە تاوان سەیر دەکرێن، لەگەڵ ئەوەشدا، جۆری سزادان جیاوازن)[٣٧].

نووسەر دوای ئەوەی زیاتر لەسەر باسەکە دەڕوا، دەیەوێ ئەخلاقی ڕۆژنامەنووسیمان باشتر بۆ روون بکاتەوە: (ڕۆژنامەنووس بە هیچ شێوەیەك بۆی نییە لەسەر کەسێك بنووسێ و ناو و وێنەی ئەو بڵاوبکاتەوە، کە گوایە تاوانێکی گەورەی کردووە، لە کاتێکدا لە دادگا هێشتا تاوانەکەی لەسەر ئاشکرا نەبووە. زۆرجار ئەگەر کابرا لە راستیدا تاوانباریش بێ، دیسان دەکرێ ناو و وێنەی بڵاونەکرێتەوە، چونکە دوور نییە خزم و کەس یان منداڵەکانی بە چاوی سووك لەناو کۆمەڵ سەیر بکرێن. ئەوە دەکاتە ئەخلاق لە ڕۆژنامەنووسی. ئێمە باس لەوە ناکەین ئەگەر کابرا بۆ کۆمەڵ ببێتە مەترسییەکی گەورە. ئەوەش وەك بۆ نموونە، کابرا منداڵ دەدزێ و دەیانباتە دەرەوەی وڵات بۆ فرۆشتن، یان نەخۆشیی ئیدزی هەیە، بۆ ئەوەی جەماوەر ئاگادار بکرێتەوە و بە زووترین کات دەستگیر بکرێ، لەو کاتانە دەکرێ بە راگەیاندن رسمی کابرا بڵاوبکەنەوە، بۆ ئەوەی بە یارمەتیی جەماوەر، پۆلیس کابرای

تاوانبار دەستگیر بکا. یانیش ئەگەر کابرا بە پارەی دوژمنـان بیـەوێ خـەڵك تـیرۆر بکاو نائاسایی بخاتە ناو کۆمەڵ.

هەر رووداوێك کە ببێتە هۆی تێکدانی ژیانی ئاسایی جەماوەر، دیسان بەبێ سێ و دوو دەکرێ ناو و وێنەی لە دەزگاکانی راگەیاندن باسبکرێ و نیشانبدرێ)[٣٨].

لە باسی ئەخلاق لە رۆژنامەنووسیی کوردیـشدا دەڵـێ: (بـۆ کـاتێکی وەك ئێـستی ناسکی کوردستان، نابێ هـیچ شتێك بڵاوبکرێتـەوە کـە ببێتـە هـۆی ئاژاوەنانـەوە بـۆ کۆمەڵ کە لە ئەنجامدا شەڕو ناخۆشی بەدوایـەوە بـێ. لـە هـەمان کاتـدا هـەموو ئـەو شتانە بڵاوبکرێنەوە، کە سوود بە بزووتنـەوەی کوردایـەتی دەگەیـەنن و رۆژێـك زووتـر کورد لە سەرکەوتن و ئازادی نزیك دەکەنەوە)[٣٩].

هەر لەبارەی ئەخلاقی رۆژنامەنووسییەوە کاك مەگدید دەڵێ: (رۆژنامـەنووس بۆخۆی نانووسێ، بەڵکو بۆ جەماوەر دەنووسێ، بۆیە دەبـێ بـیر لـە هـەموو ئـەو شـتانە بکاتـەوە کـە لـە گوتارەکـەی بـەکاری دەهێنـێ جگـە لـەوەش مەسـەلەی ئەخلاق دەبێ بە هیچ شێوەیەك پشتگوێ نەخرێ. ئەگـەر رۆژنامـەنووس لـەکاتی نووسینی بیری لەو بۆچوونانەی سـەرەوە کـردەوە، بێگومـان نووسـینەکەی جگـە لەوەی بێ کەموکورتی دەبێ، زۆر خزمـەتی ئەو کۆمـەڵەش دەکا کە خۆی لەناویدا دەژی. رۆژنامەنووس بۆ ئەوەی کەرامەتی خۆی و قودسیەتی پیشەکەی بپارێزێ، نـابێ بـە هـیچ شـێوەیەك گوتارێـك بنووسـێ، کـە خـۆی بـڕوای تـەواوی بـە نێوەڕۆکەکەی نەبێ)[٤٠].

* * *

شایانی باسە نووسەری کتێبی (تیۆری رۆژنامەنووسی) تـا ئێـرە سـوودی لـە (٧٢) سەرچاوە وەرگرتووە، سەرچاوەکان بە زمانی رووسی و سویدی و ئینگلیزی و عەرەبین.

لاپەڕە (١٤٩-١٩٩)ی کتێبەکە بۆ (پاشـکۆ) تـەرخانکراوە، ئـەم پاشـکۆیەش دوو بابەتی بەخۆیەوە گرتووە:

١- باسێك لەسەر گۆڤاری (دیدار) کە یەکێتی لاوانی کورد لە سوید بە هەردوو دیالێکتی زمانی کوردی (سۆرانی و کرمانجی) دەریکردووە و یەکەمین ژمارەی لە نیسانی ١٩٩٢ دەرچووە.

٢- لێکۆڵینەوەیەك لە بارەی ناوەڕۆکی دوانزە ژمارەی رۆژنامەی (کوردستانی نوێ) کە بە زمانی رووسی یەکەمین ژمارەی لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٧ لە رووسیا دەرچووە.

لێرەدا بە پێویستی نازانم ئەم دوو بابەتە هەڵبسەنگێنم، نەك لەبەر ئەوەی بابەتی گرنگ نین و شایانی ئەوەنین لەسەریان بنووسرێ بەڵکو لەبەر ئەوەی، بەڕای من، بابەتی سەربەخۆن و زۆر پێوەندییان بە کتێبەکەوە نییە.. باشتر وابوو ئەم دوو بابەتە وەك نامیلکەی سەربەخۆ لە چاپ بدرابوونایە.

بەڵام لێرەدا نامەوێ لە کاکە مەگدید و خوێنەرە بەڕێزەکان بشارمەوە کە دوو تێبینی بچووکم لەسەر بابەتی یەکەمیان هەیە:

١- لە لاپەڕە (١٥٣)دا نووسەری بەڕێز دەڵێ: (ئەگەر سەیری یەکەمین رۆژنامەی کوردی، رۆژنامەی کوردستان کە لە ٢٢ی نیسانی ١٨٩٨ لەلایەن میقداد مەدحەت بەدرخان دەرچوو بکەین و بەخێرایی چاوێك بە ژمارەکانی بخشێنین، بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو ٣١ ژمارەیەی لە ماوەی پێنج ساڵاندا، کە تائێستا بۆ زانایان ئاشکرایە دەرچووبن، پێنج جار شوێنی چاپکردنی گۆڕاوە. ئەمەش دیارە بە ویستی میقداد مەدحەت بەدرخان و عەبدولڕەزاقی برای نەبووە)[٤١].

دیارە دوای میقداد مەدحەت عەبدولڕەحمانی برای جێی ئەوی گرتەوە نەك عەبدولڕەزاق، هەروەکو نووسەر رایگەیاندووە.

٢- لەبارەی هەردوو گۆڤاری منداڵان (ئەستێرە)ی سلێمانی و (ئەستێرە)ی بەغدا، نووسەری بەڕێز زانیارییەکانی لێ تێکەڵاو بووە، دیارە ئەمەش لەبەر دووریی نووسەرە لە کوردستان، یان لەبەر ئەوەی تائێستا چەند گۆڤارێکی منداڵانمان بە ناوی (ئەستێرە)وە هەیە و ئەگەر مرۆڤ زۆر ئاگادار نەبێ، لەوانەیە لێی بشێوێ. نووسەر لەم

رووەوە دەڵێ: (دوای گۆڤاری گڕوگاڵی منداڵان، دوو گۆڤاریتری کوردی بەناوی ئەستێرە دەرچوون، ئەوانیش هەریەك لە چەند ژمارەیەك زیاتری لێدەرنەچووە. ئەستێرەی یەکەم د.ئیحسان سەرنووسەری بووە و دوو ژمارەشی لە بەغدا لە ساڵی ١٩٧٥ لێ چاپکراوە. ئەستێرەی دووەم ساڵح یووسفی سەرنووسەری بووە و لە شاری سلێمانی ژمارە یەکی لە هاوینی ١٩٧٢دا بڵاوکراوەتەوە. ژمارە دووی بۆ چاپ ئامادەبووە بەڵام بێ چاپ کردن ماوەتەوە)[٤٢].

لێرەدا روخسەت لە نووسەری بەڕێز دەخوازم و زانیارییەکە بەم جۆرە راست دەکەمەوە: ئەستێرەی یەکەم ساڵح یووسفی سەرنووسەری بووە و لە شاری سلێمانی ژمارە یەکی لە هاوینی ١٩٧٢دا لێ بڵاوکراوەتەوە، ژمارە دووی لە ئەیلوولی هەمان ساڵدا دەرچووە، دوا ژمارەیشی، کە ژمارە سێیە، لە شوباتی ساڵی ١٩٧٤دا دەرچووە. ئەستێرەی دووەم د.ئیحسان فوئاد سەرنووسەری بووە و ژمارە یەکی لە مایسی ١٩٧٥ دەرچووە، ژمارە دووی لە حوزەیرانی ١٩٧٥ چاپکرا، بەڵام پێش ئەوەی بڵاوبکرێتەوە، حکوومەت دەستی بەسەرداگرت و بڵاونەکرایەوە، گۆڤارەکەش وەستا.

کتێبەکە بە شێوەیەکی گشتی بە زمانێکی پاك و ئاسان نووسراوە و خوێنەر لە خوێندنەوەی بێزار نابێ، هەرچەندە هەندێك رستە هەن لە رووی داڕشتنەوە وەکو پێویست نین، بۆ نموونە:

* (لە رۆژنامەنووسەکانی هەرە بەناوبانگەکانی سەدەی بیستی کوردە)، ل٤٥.

دەبووایە بڵێ: (لە رۆژنامەنووسە هەرە بەناوبانگەکانی کوردە لە سەدەی بیستەمدا).

* (رووش دەدا کە دیگتافۆنەکە قسەکانی خراپ تۆمارکردووە)، ل٥٥.

دەبووایە بڵێ: (وادەبێ دیگتافۆنەکە قسەکانی خراپ تۆمارکردووە).

* (تەنها لە گۆڤاری دیدار کە لە سوید دەردەچوو، ژمارەکانی دوایی بەرچاوم کەوتووە)، ل٦٢.

باشتر وابوو بڵێ: (تەنها لە ژمارەکانی دوایی گۆڤاری (دیدار) دا، کە لە سوید دەردەچوو، بەرچاوم کەوتووە.

* (چاکەئەوانەی لە رادیۆ تەلەفزیۆنەکانیش کاردەکەن، جگە لەوەی دەبێ رۆژنامەنووسی چاك بن، دەبێ بیر لە دەنگیش بکرێتەوە)، ل٦٦.

دەبووایە بلێ: (ئەوانەی لە رادیۆ و تەلەفزیۆنەکانیشدا کاردەکەن، جگە لەوەی دەبێ رۆژنامەنووسی چاك بن، دەبێ دەنگیشیان باش بێ).

لە کۆتاییدا پیرۆزبایی لە کاکە مەگدید سەپان دەکەم و هیوادارم هەردەم بەردەوام بێت لە پێشکەشکردنی بەرهەمی بەپێز و سەرکەوتوو لە بواری رۆژنامەنووسیدا.

خۆزگە دەزگایەکی رۆشنبیریی کوردستانیش ئەو کتێبەی بۆ جاری دووەم لە چاپ دەدایەوە، بۆ ئەوەی رۆژنامەنووسان زیاتر سوودی لێ وەربگرن.

## سەرچاوەکان

* لە گۆڤاری (ڕۆژنامەڤانی) ژمارە (٤)ی ٢٢ی نیسانی ٢٠٠١، لاپەڕە (١٨٨-٢٠٠٢)دا بڵاوکراوەتەوە.

(١) مەگدید سەپان، تیۆری ڕۆژنامەنووسی، چاپی سوید، ٢٠٠٠، ل١٦.

(٢) هەمان سەرچاوە، ل١٧.

(٣) هەمان سەرچاوە، ل٧.

(٤) هەمان سەرچاوە، ل١٥.

(٥) هەمان سەرچاوە، ل١٩.

(٦) هەمان سەرچاوە، ل١٩و٢٠.

(٧) هەمان سەرچاوە، ل٢٠.

(٨) هەمان سەرچاوە، ل٢٠و٢١.

(٩) هەمان سەرچاوە، ل٢٥.

(١٠) هەمان سەرچاوە، ل٢٧.

(١١) هەمان سەرچاوە، ل٢٧.

(١٢) هەمان سەرچاوە، ل٣١.

(١٣) هەمان سەرچاوە، ل٣١.

(١٤) هەمان سەرچاوە، ل٣٣.

(١٥) هەمان سەرچاوە، ل٣٧.

(١٦) هەمان سەرچاوە، ل٣٩.

(١٧) هەمان سەرچاوە، ل٤٠و٤١.

(١٨) هەمان سەرچاوە، ل٤٩و٥٠.

(١٩) هەمان سەرچاوە، ل٥٠.

(٢٠) هەمان سەرچاوە، ل٥٣و٥٤.

(٢١) هەمان سەرچاوە، ل٥٤.

(٢٢) هەمان سەرچاوە، ل٦٢.

(٢٣) هەمان سەرچاوە، ل٦٥و٦٦.

(٢٤) هەمان سەرچاوە، ل٧٦.

(٢٥) هەمان سەرچاوە، ل٧٩.

(٢٦) هەمان سەرچاوە، ل٨٠ و ٨١.

(٢٧) هەمان سەرچاوە، ل٨٢.

(٢٨) هەمان سەرچاوە، ل٩٥.

(٢٩) هەمان سەرچاوە، ل٩٧.

(٣٠) هەمان سەرچاوە، ل١٠١.

(٣١) هەمان سەرچاوە، ل١٠٢.

(٣٢) هەمان سەرچاوە، ل١١٧.

(٣٣) هەمان سەرچاوە، ل١١٨.

(٣٤) هەمان سەرچاوە، ل١٢١.

(٣٥) هەمان سەرچاوە، ل١٢٣.

(٣٦) هەمان سەرچاوە، ل١٢٨.

(٣٧) هەمان سەرچاوە، ل١٣١ و ١٣٢.

(٣٨) هەمان سەرچاوە، ل١٣٥ و ١٣٦.

(٣٩) هەمان سەرچاوە، ل١٣٧ و ١٣٨.

(٤٠) هەمان سەرچاوە، ل١٣٨.

(٤١) هەمان سەرچاوە، ل١٥٣.

(٤٢) هەمان سەرچاوە، ل١٥٤.

# یەکەمین ژمارەی گۆڤاری (نووسەری نوێ)*

دوای ئەوەی دەستەی دووەمی بەڕێوەبردنی یەکێتیی نووسەرانی کورد-لقی هەولێر لە ئێوارەی ڕۆژی ١٥/٨/١٩٧١دا هەڵبژێردراو بەڕێزان عیزەدین فەیزی بە سەرۆکی لق و حەمەکەریم هەورامی بە جێگری سەرۆك و کەریم شارەزا بە سکرتێری بەڕێوەبردن و محەمەد حەسەن مەنگوڕی بە سکرتێری ڕۆشنبیری و عەزیز گەردی بە ژمێرشناو بە ئەندام و جەمیل ڕەنجبەر و عەبدوڵڵا و پەشێوو ێریار و جەلال مەدحەت مەدحت بێخەو بە ئەندامی یەدەگی دەستەکە دەرچوون[1]، ئەو دەستەیە هەر زوو چالاکیی خۆی لەبارەی گێڕانی کۆڕی ئەدەبییەوە بە دوو شێوە دەستپێکرد:

١- کۆڕی ڕاستەوخۆی ئەدەبی بۆ جەماوەری ئەدیب و ئەدەب دۆستان[2].

٢- پێشکەشکردنی بەرنامەی ئەدەبی لە تەلەفزیۆنی مووسڵ، کە ئەوسا نزیکترین ئێستگەی تەلەفزیۆن بوو لە هەولێر.

کارێکی دیکەی ئەو دەستە چالاکە، بڵاوکردنەوەی گۆڤارێکی ئەدەبیی تایبەت بە لقی هەولێر بوو. ئەوەبوو لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٢دا یەکەمین ژمارەی گۆڤاری (نووسەری نوێ)[3] دەرچوو.

دەستەی نووسەرانی ئەو ژمارەیە بریتیبوون لە: عیزەدین فەیزی، حەمەکەریم هەورامی، کەریم شارەزا، محەمەد حەسەن مەنگوڕی، عەزیز گەردی، جەمیل ڕەنجبەر و مەدحەت بێخەو[4].

ئەم ژمارەیەی گۆڤاری (نووسەری نوێ) کە لەسەر بەرگی یەکەم و دووەمی گۆڤارەکەدا نووسراوە/: (کۆمەڵە بەرهەمێکی ئەدەبییە یەکێتیی نووسەرانی کورد-لقی هەولێر دەریدەکات)، بە (٥٦) لاپەڕەو تیراژی (١٠٠٠)دانە دەرچووە و لە چاپخانەی کوردستان لە هەولێر چاپکراوە و نرخی (١٢٠) فلسە.

لەم ژمارەیـەدا (١٥) نووسـەر و شـاعیر بەرهـەمـی ئـەدەبییان لـە وتـار و شـیعر و چیرۆك و زمانەوانی بڵاوکردووەتەوە و هەمووشیان لە ئەندامانی هەمان لـق بـوون، کـە ئەمانـەن: عیـزەدین فـەیزی، محەمـەد حەسـەن مـەنگوڕی، مەدحـەت بێخـەو، عـەزیز گەردی، سەعدوڵڵا پەرۆش، کەریم شارەزا، پیرباڵ مەحموود، مەغدیـد سـۆران، سـامیە مەشخەڵ، ئەحمەد نەقشبەندی، فەرید زامدار، عەبدولخالق سەرسام، جـەمیل ڕەنجبـەر، مەجید ئاسنگەر و جەلال مەدحەت خۆشناو.

(وتاری ژمارە) لەلایەن سـەرۆکی ئەوسـای لـق مامۆسـتا (عیـزەدین فـەیزی)یـەوە نووسراوە، نووسەر لە سـەرەتای وتارەکەیـدا مـژدەی دەرچـوونی ئـەم پەخـشنامەیە بـە خوێنەران دەدات و داوای هاوکاریی هەموو لایـەك دەکـات بـۆ بـەردەوامبوون و زیـاتر پێشکەوتنی گۆڤارەکە: (تکامان وایە لە کەموکورتیمان ببوورن و ئاگاداریشمان بکـەن بۆ ڕێگەی باشترو بەهێزتر بۆ پێشخستن و پێگەیاندنی ئـەم بەرهەمـە سـاوایە، چـونکە هیچ نووسراوێك چ گۆڤار چ ڕۆژنامە وە یا شتیتر بێت ئەگـەر خوێنـەر لەگـەڵ نووسـەر پێکەوە شان بەشانی یەکتر بۆی نەچن و تەقەلای بۆ نەدەن بێگومـان پـێش ناکـەوێت و پلەشی بەرزنابێتەوە، هەروەکو وتراوە: چەپڵە بە دەستێك لێنادرێت...)[٥].

پاشان ئاماژە بەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە دەکات، کە بەر لە گۆڤارەکەی ئەوان لە هەولێر دەرچوونە، وەکو گۆڤـاری (زاری کرمـانجی)ی ڕەوانـدز (١٩٢٦) و گۆڤـاری (ڕوونــاکی) ١٩٣٥ و ڕۆژنامـــەی (هـــەولێر) ١٩٥٠ و گۆڤـــاری (هـــەتاو) و گۆڤاری (هەولێر)...

لە کۆتایی وتارەکەیدا، مامۆستا فەیزی ڕوو لە نووسەر و شـاعیر و چیرۆکنووس و ڕۆشنبیران دەکات و دەڵێ: (جا بەم بۆنەیەوە بانگـەوازێك پێـشکەش هـەموو نووسـەرو شاعیرو چیرۆکنووس و ڕۆشنبیران دەکەین هەر بەرهەمێکیان هەبێت چ بـۆ ((نووسـەری نوێ)) بێت، چ بـۆ گیرانـی کـۆڕ بێـت بۆمـانی بنێـرن و یـان خۆیـان بـێن بـۆ بارەگـای یەکێتیی مامۆستایانی کوردستان، ئێمەش دەستەی یـەکێتیی نووسـەران لقـی هـەولێر ڕۆژانی هەینی لە سەعات سێی پاش نیوەڕۆ ئامادەین لەوێ بۆ دیدەنی یەکتر)[٦].

چوارده بابەتەکەی دیکەی ئەم ژمارەیە بریتین لە (٤) وتارو (٦) شیعرو (١) لێکۆڵینەوەو (٢) چیرۆك و (١) زمانەوانی.

سێ لاپەڕەی کۆتایی ژمارەکەش بۆ هەواڵی ئەدەبی و چالاکییەکانی لق تەرخانکراوە.

لێکۆڵینەوەکە بەناونیشانی (لاپەڕەی دووەم لە شیعری کلاسیکی کوردیماندا)یەو مامۆستا کەریم شارەزا نووسیویەتی و تێیدا ئەوە روون دەکاتەوە، کە ئەوەی بە رواڵەت لە رووپەڕی یەکەمی دیوانی شاعیرە کلاسیکییەکانماندا بەرچاو دەکەوێت وەکو پێویست تەعبیر لە بارەی ژیانی راستەقینەی زۆربەی میللەتی کورد ناکات و دەڵێ: (ئێمە ئەگەر سەرنج بدەینە دیوانی شاعیرە کلاسیکییەکانمان، وامان بۆ دەردەکەوێ کە شاعیرانمان لە کۆمەڵگاییەکی دوور لە کوێرەوەری و چەوسانەوەدا، لە کۆمەڵگاییەکی تێروتەسەل و بەختیاردا، لە کۆمەڵگای پاشا و میرو سەرداراندا ژیاون، تەنیا باسی زوڵفی درێژ و چاوی بەخەو و گەردەنی زەرد و سنگی بلوورین بووە، هەڵبەستەکانیان بۆ رابواردن و سوودی دەستەو چینی کاربەدەستان بووە. وەك بڵێی میللەتی کوردمان لەو سەردەمەدا مەلەوانی کردبێ لەناو دەریاییەکی پڕ لە خێرو خۆشی و بەختەوەریدا)[٧].

پاشان رووپەڕی دووەمی ئەو جۆرە شیعرانەمان بۆ روون دەکاتەوە و دەڵێ ئەم جۆرەیان باری ژیانی راستەقینەی زۆربەی کۆمەڵ دەردەبڕێ و رەگی شیعرەکانی ئەم لاپەڕەیەش بۆ باوکی شاعیرانی کورد (بابا تاهیری هەمەدانی ٩٣٥-١٠١٠) دەگێڕێتەوە کە ئاواتە خوازبووە دەستی بگاتە چەرخی گەدوون و جیاوازیی چینایەتیی بە گوێچکەیدا بچرپێنێ:

ئەگەر دەستم رەسەد بەرچەرخی گەردوون
ئەزان پرسەم کە ئین چونەست و ئان چوون
یەکێ رادەدائی سەد نازو نیعمەت
یەکێ را قورسی جۆ ئالوودە دەرخوون[٨]

پاشان چەند نموونەیەکی زیندووی شاعیرە کلاسیکییەکانی دیکە لەم رووەوە دێنێتەوە، بەتایبەتی شیعری شاعیران: (ئەحمەدی خانی ١٦٥٠-١٧٠٦) و (سالم ١٨٠٠-١٨٦٦) و (حاجی قادری کۆیی ١٨١٦-١٨٩٧) و (شێخ رەزای تاڵەبانی ١٨٤٢-١٩١٠). هەروەها ئاماژە بە چەند داستانێکی جەنگی و دڵداریش دەکات، کە راستەوخۆ باری ژیانی راستەقینەی کۆمەڵی کوردەواری دەردەبڕن، وەکو داستانی (مەم و زین) و (قەڵای دمدم) و بەیتی ئاوڕەحمان پاشا) و (وەسمان پاشا) و (عەزیز تەکش) و (خەج و سیامەند)... تاد.

بابەتە تایبەتییەکەی زمانەوانیش بەناوی (زمان و کۆمەڵ)ەو مامۆستا (ئەحمەد نەقشبەندی) نووسیویەتی و سێ لاپەڕەی گۆڤارەکەی بۆ تەرخانکراوە.

نووسەر لە میانەی وتارەکەیدا زمان لەسەر بنەڕەتی کۆمەڵایەتییەوە دابەشی سەر چوار بەش دەکات: (زمان لەسەر بنەڕەتێکی کۆمەڵایەتییەوە) دەکرێ بە چوار بەشەوە:

١- شێوەکانی کاتی.
٢- شێوەکانی هەرێمایەتی.
٣- شێوەکانی چینایەتی.
٤- شێوەکانی هاوبەش[٩].

پاشان بە کورتی باسی هەریەك لەم چوار بەشە دەکات.

ئەم ژمارەیەی گۆڤاری (نووسەری نوێ) جگە لە (وتاری ژمارە) چوار وتاری دیکەشی بەخۆیەوە گرتووە:

١- ئەدەبی کوردی، محەمەد حەسەن مەنگوڕی، کورتەباسێکە لەبارەی ئەدەب و رێبازەکانی بەگشتی و ئەدەبی کوردی بەتایبەتی، (٣) لاپەڕەی بۆ تەرخانکراوە.

٢- منداڵ و پەروەردە و چیرۆك، عەزیز گەردی، بابەتێکی پەروەردەییە باسی رۆڵی منداڵ دەکات و رێنماییەکی سەرەتاییشە بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێ چیرۆك و بابەتی دیکە بۆ منداڵ بنووسن، (١١) لاپەڕەی بۆ تەرخانکراوە.

٣- پشکۆیەك لە ئاسۆی غەمدا، فەرید زامدار، پەیامێکی دڵدارییە، لاپەڕەو نیوێکی بۆ تەرخانکراوە.

٤- چەند پاشماوەیەك لە ئایینی زەردەشتییەوە، عەبدولخالق سەرسام، (٣) لاپەڕەی بۆ تەرخانکراوە.

دوو چیرۆکەکەش ئەمانە:

١- بلێسەی خەیاڵ، مەغدید سۆران، (٣) لاپەڕە.

٢- زارا، مەجید ئاسنگەر، (٦) لاپەڕە.

بە ژمارەی بابەت بەشی شێر لەم ژمارەیەدا بەر شیعر کەوتووە و لە (١٥) بابەتی گۆڤارەکە (٦)ی بۆ شیعر تەرخانکراوە. شیعرەکانیش بەپێی زنجیرەی بڵاوکردنەوەیان ئەمانەن:

١- پایز و سروشت، مەدحەت بێخەو.

٢- داخوازی، سەعدوڵلا پەرۆش.

٣- جادووگەر، پیرباڵ مەحموود.

٤- سوودانی سوور، سامیە مەشخەڵ.

٥- بڕیارێك لە گەرووی ئاگردا، جەمیل ڕەنجبەر.

٦- با... نیازێك بپشکوێ...، جەلال مەدحەت خۆشناو.

ئەمەو دوو تێبینی زەق لەم ژمارەیەی گۆڤاری (نووسەری نوێ)دا بەرچاو دەکەون، کە ئەمانەن:

١- بابەتەکان بەشێوەیەکی هونەری پۆلین نەکراون و جۆری بابەتەکان لە یەکتر جیانەکراونەتەوەو تێکەڵ بە یەکەوە کراون. بۆ نموونە: شیعری (پایز و سروشت) لە نێوان دوو وتاردایە و چیرۆکی (بلێسەی خەیاڵ) کەتووەتە نێوان دوو شیعرەوە...تاد.

٢- لەسەر شێوەی ڕۆژنامەنووسیی جاران، هەندێك لە بابەتەکانی ئەو ژمارەیە پاشماوەیان لە لاپەڕەی دیکە بڵاوکراوەتەوە، بۆ نموونە: پاشماوەی (وتاری ژمارە) لە لاپەڕە چوارەوە چووەتە لاپەڕە (٩)و پاشماوەی (پشکۆیەك لە ئاسۆی غەمدا) لەلاپەڕە (٤٠)ەوە گەڕاوەتەوە بۆ لاپەڕە (٢٣)...تاد.

## سەرچاوەکان

* لە گۆڤاری (نووسەری نوێ) ژمارە (٤٠)ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٨دا بڵاوکراوەتەوە.

(١) دوای ئەوەی جەلال مەدحەت خۆشناوی ئەندازیار کاری فەرمیی بۆ پارێزگای کەرکووك گواسترایەوە، دەستەی بەڕێوەبردن لە کۆبوونەوەی رۆژی ٢٣/١١/ ١٩٧١دا بڕیاریدا مەدحەت بێخەو جێگەی ئەو بگرێتەوە.

(٢) یەکەمین کۆڕی ئەدەبی دوای هەڵبژاردنی ئەو دەستەیە بەناونیشانی (کۆن و نوێ لە شیعری کوردیدا) لەلایەن عەزیز گەردی و بەهاوبەشی عیزەدین فەیزی و کەریم شارەزاوە لە ئێوارەی رۆژی ٣٠/٩/١٩٧١دا پێشکەشکرا.

(٣) لە ساڵانی (١٩٧٢-١٩٨٠)دا پێنج ژمارەی لێدەرچووە، ئێستاش لە خولی تازەی بەردەوامە لە دەرچوون.

(٤) هەرچەندە زۆربەی ئەندامە دێرینەکانی یەکێتیی نووسەران، بەتایبەتی ئەندامانی لقی هەولێر، تارادەیەکی باش زانیارییان لەبارەی ئەم ژمارەیەوە هەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی تائێستا (٣٦) ساڵ بەسەر دەرچوونیدا تێپەڕیوەو لەم ماوەیەدا نووسەر گەلێك هاتوونەتە گۆڕەپانەکەوە، لەوانەیە زۆربەیان وەکو پێویست ئاشنای ئەم ژمارەیە نەبووبن، بە باشم زانی ئەم کورتە زانیارییەی لەبارەیەوە بنووسم.

(٥) نووسەری نوێ، ژ١، ساڵی ١٩٧٢، ل٣.

(٦) هەمان سەرچاوە، ل٩.

(٧) هەمان سەرچاوە، ل٢٤.

(٨) هەمان سەرچاوە، ل٢٤ و ٢٥.

(٩) هەمان سەرچاوە، ل٣٨.

# ڕۆشنبیریی منداڵان لە (٤٨) ژمارەی ساڵەکانی بەرایی گۆڤاری (رامان)دا

گۆڤاری (رامان) گۆڤارێکی ڕۆشنبیریی گشتییە و ڕۆشنبیریی منداڵان بەشێکە لەو ڕۆشنبیرییە گشتییە، بۆیە جێی خۆیەتی بەشی خۆی لە گۆڤارەکەدا هەبێت.

گۆڤاری (رامان) لە چوار ساڵی یەکەمی تەمەنیدا (٤٨) ژمارەی ڕێکوپێک و بێ دواکەوتنی لێ دەرچووە و زۆربەی ژمارەکانی ئەو چوار ساڵەش بابەتی تایبەت بە منداڵانی تێدایە.

هەرچەندە ڕێژەی بابەتەکانی تایبەت بە منداڵ بەرامبەر بە سەرجەم بابەتەکانی گۆڤارەکە لەگەڵ ڕێژەی منداڵان بەرامبەر بە سەرجەم دانیشتووانی کوردستان ناگونجێ، چونکە لە کۆی (١٠٩٦٨) لاپەڕەی هەر (٤٨) ژمارەی گۆڤارەکە تەنیا (٢٦٠) لاپەڕەی بۆ ڕۆشنبیریی منداڵان تەرخانکراوە بە هەموو بەشەکانییەوە.

ڕەنگە برادەرانی گۆڤاری (رامان) پاساویان بۆ ئەمە هەبێت و بڵێن گۆڤارەکە تایبەت نییە بە منداڵان و بەهۆی بابەتە چڕەکان و قەبارەی گەورەی گۆڤارەکەشەوە دوورە دەستە لە منداڵ و ڕێژەی نووسەرانی تایبەت بە منداڵانیش لەگەڵ ڕێژەی سەرجەم نووسەرانی کوردستان ناگونجێ، سەرەڕای ئەمانەش ئەوەندە بابەتی سەرکەوتوو و بەپێزی تایبەت بە منداڵانیشیان بۆ ڕەوانە نەکراوە کە لە ئاستی گۆڤارەکەدا بن و شایانی ئەوەبن چەند لاپەڕەیەکیان بۆ تەرخانبکرێ.

ئەمانە هەمووی پاساوی بەجێن و حیسابیان بۆ دەکرێ. لە گەشتێکی خێرادا بەناو لاپەڕەکانی هەر (٤٨) ژمارەی گۆڤای (رامان)دا بۆمان ڕووندەبێتەوە کە خشتەی دابەشکردنی بابەتەکانی تایبەت بە منداڵ لە لاپەڕەکاندا بەم شێوەیە:

| ژماره | ژمارەی بابەتەکانی تایبەت بە مندال | ژمارەی لاپەڕەکانی | کۆی هەموو لاپەڕەکانی گۆڤارەکە |
|---|---|---|---|
| ١ | ٢ | ١ | ٥٨ |
| ٢ | — | — | ١٠٠ |
| ٣ | ٢ | ٦ | ١٠٢ |
| ٤ | ١ | ٥ | ١١٤ |
| ٥ | ١ | ٦ | ١١٤ |
| ٦ | ٢ | ٤ | ١٢٢ |
| ٧ | ١ | ٤ | ١٢٢ |
| ٨ | — | — | ١٢٢ |
| ٩ | ٢ | ٦ | ١٣٠ |
| ١٠ | ٣ | ١٠ | ١٢٦ |
| ١١ | ٢ | ٦ | ١٣٠ |
| ١٢ | ٣ | ١١ | ١٣٠ |
| ١٣ | — | — | ٢٢٢ |
| ١٤ | ١ | ٢ | ١٩٤ |
| ١٥ | ١ | ٢ | ١٧٠ |
| ١٦ | ١ | ٣ | ١٩٦ |
| ١٧ | ٢ | ٧ | ١٦٠ |
| ١٨ | ٢ | ٧ | ١٧٠ |
| ١٩ | ٣ | ١٢ | ١٨٠ |
| ٢٠ | ١ | ٥ | ٢٠٦ |
| ٢١ | — | — | ٢١٢ |
| ٢٢ | ١ | ١٠ | ٢٢٨ |
| ٢٣ | — | — | ٢٤٢ |
| ٢٤ | ٣ | ١٠ | ٢٢٦ |

| ٢٥ | ١ | ٢ | ٢٤٢ |
|---|---|---|---|
| ٢٦ | — | — | ٢٤٦ |
| ٢٧ | ٢ | ٨ | ٢٥٤ |
| ٢٨ | — | — | ٢٤٦ |
| ٢٩ | ٢ | ٥ | ٢٨٦ |
| ٣٠ | ٢ | ٨ | ٢٥٠ |
| ٣١ | ٣ | ١٢ | ٢٦٤ |
| ٣٢ | ١ | ٢ | ٢٤٠ |
| ٣٣ | ٥ | ١٩ | ٢٧٦ |
| ٣٤ | ٥ | ١٧ | ٣٧٠ |
| ٣٥ | ٣ | ١٠ | ٢٧٦ |
| ٣٦ | ١ | ٢ | ٣٢٠ |
| ٣٧ | — | — | ٣٤٦ |
| ٣٨ | ٣ | ٦ | ٣٢٤ |
| ٣٩ | ١ | ٢ | ٣٢٠ |
| ٤٠ | ٢ | ٥ | ٣٣٠ |
| ٤١ | ٣ | ١٢ | ٣٢٠ |
| ٤٢ | ٤ | ١٢ | ٣٢٠ |
| ٤٣ | ١ | ٤ | ٣٣٤ |
| ٤٤ | ١ | ٣ | ٣٠٢ |
| ٤٥ | ٣ | ٩ | ٣١٨ |
| ٤٦ | ١ | ١ | ٣٤٦ |
| ٤٧ | ١ | ٣ | ٣٣٠ |
| ٤٨ | ١ | ١ | ٣٣٢ |
| هەمووی | ٨٠ | ٢٦٠ | ١٠٩٦٨ |

سەبارەت بە دابەشکردنی بابەتەکانیش بەسەر بەشەکانی رۆشنبیریی منداڵاندا، بەم جۆرەیە:

١- شانۆی منداڵان و دەقی شانۆیی/ ١٤ بابەت
٢- لێدوانی کتێب / ١٣
٣- وتاری هەمەجۆر / ١١
٤- چیرۆك و چیرۆکی وەرگێڕدراو / ٩
٥- هونەر / ٧
٦- لێکۆڵینەوە / ٦ (یەکێکیان سێ ئەڵقەیە)
٧- دەروونزانی / ٦
٨- رۆژنامەنووسیی منداڵان / ٣
٩- مێزگرد / ٣
١٠- ئۆپەرێت / ٢
١١- رۆمان / ١ (بەسێ ئەڵقە)
١٢- دیمانە / ١

ئێستا ئەگەر بە لاپەڕەی هەر (٤٨) ژمارەی گۆڤارەکەدا بچینەوە، دەبینین بابەتەکان بەپێی ژمارە بەم جۆرەن:

| ژمارە | ناوی بابەت | ناوی نووسەر | لاپەڕە |
|---|---|---|---|
| ١ | ١- مریشك بۆ میهڤانی<br>٢- دافینشی و چیرۆکی منداڵان | عەبدولغەنی عەلی یەحیا<br>و. محەمەد ساڵەیی | ٥٣<br>٥٣ |
| ٣ | ١-گۆتۆ و گەواڵە هەورەکان<br>٢- دەریای منداڵان/ بەشی یەکەم | جەمال نووری<br>رۆستەم باجەلان | ٦١<br>٦٢-٦٦ |
| ٤ | دەریای منداڵان/ بەشی دووەم | رۆستەم باجەلان | ٨٦-٩٠ |
| ٥ | دەریای منداڵان/ بەشی سێیەم | رۆستەم باجەلان | ٦٩-٧٤ |
| ٦ | ١-سێ کورتە چیرۆك بۆ منداڵان (کەڵەشێر، مریشك، مانگا)<br>٢-ئۆپەرێتی بەرخ و مام گورك | و. کوردستان عەبدولڕەزاق<br>جەمال نووری | ٩٨-١٠٠<br>١٠١ |
| ٧ | چیرۆکی پۆپنەزێرینە | و. هیمەت عەزیز کاکەیی | ٩٦-٩٩ |
| ٩ | ١-ئەستێرەی سلێمانی... ئەستێرەی بەغدا... ئەستێرەی شاخ..!!<br>٢-رێوی و مام ورچ | دارا محەمەد علی<br>جەمال نووری | ١٥-١٩<br>٩٢ |
| ١٠ | ١-خەنجەری ناو سندووقەکە<br>٢-گورگ<br>٣-شانۆی بووکەڵە | موحسین محەمەد<br>و. عەزیز رەشید هەریری<br>______ | ٦٨-٧٢<br>١٢٢-١٢٥<br>١٢٦ |
| ١١ | ١-ئۆپەرێتی بەردەبووك<br>٢- دەروازەیەك بەرەو تێگەیشتن لە | رۆستەم باجەلان<br>فاررووق هۆمەر | ٧٠-٧١<br>٩١-٩٤ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | هونەری منداڵ/١ | | |
| ١٢ | ١- بەهانای ئەم پرۆژەیە وەرن | شاهین نەجمەدین | ٣٨-٣٤ |
| | ٢-دەروازەیەك بەرەو تێگەیشتن لە هونەری منداڵ/٢ | فاروق هۆمەر | ١١٠-١٠٧ |
| | ٣-منداڵ و فلیمی سینەمایی | لەتیف هەڵمەت | ١١٥-١١٤ |
| ١٤ | جیهانی (ئەسترید لیندگرین) | لیدوانی/ رۆستەم باجەلان | ١٩٤-١٩٣ |
| ١٥ | چیرۆکی شقارتە فرۆشەکە | و. کاکە باس | ١٣١-١٣٠ |
| ١٦ | منداڵ و مۆسیقا/ ئەڵقەی دووەم | فرەنسیس داود | ١٥٥-١٥٣ |
| ١٧ | ١-ئەدەبی منداڵان لە گۆڤاری گەلاوێژدا/ ئەلقەی یەکەم | ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی | ٩-٥ |
| | ٢-منداڵ و مۆسیقا/ئەلقەی دووەم | فەرنسیس داود | ١٤١-١٤٠ |
| ١٨ | ١-ئەدەبی منداڵان لە گۆڤاری گەلاوێژدا/ ئەلقەی دووەم | ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی | ٤٢-٣٨ |
| | ٢-شۆڕشی زارۆکا | و. سۆلاڤ ئەحمەد | ٩٥-٩٤ |
| ١٩ | ١-ئەدەبی منداڵان لە گۆڤاری گەلاوێژ/ ئەلقەی سێیەم | ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی | ٢٦-٢٣ |
| | ٢-بابانوئێل سەر لە منداڵانی کورد دەدا | ئاوات حەسەن ئەمین | ١٢٩-١٢٧ |
| | ٣-رۆژنامە و رادیۆی منداڵان بەر لە نیو سەدە لە ئاکرێ | غازی حەسەن | ١٣٤-١٣٠ |
| ٢٠ | واڵت دیزنی | و. گرفتار کاکەیی | ١٥٠-١٤٦ |
| ٢٢ | شانۆگەریی بەرهەمی ئەفسووناوی | و. محەمەد فەریق حەسەن | ١٥٠-١٤١ |
| ٢٤ | ١-بەبۆنەی رۆژی جیهانی منداڵان | ئامانج عوسمان حەمەد | ٣٧-٣٥ |
| | ٢-منداڵان چۆن وێنە دەکێشن؟! | عەبدول محەمەد ئەحمەد | ٤١-٣٨ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣٤ | ١-دایە گەورە<br>٢-دڕندەی دارستان<br>٣-درەخت و خۆر<br>٤-کەلیلە و دیمنە/ شانۆی مێردمندالآن<br>٥-مێژووی شانۆی مندالآن | عومەری عەلی ئەمین<br>هیوا سوعاد<br>لەتیف نوعمان<br>موحسین محەمەد<br>ئەیوب گەلالّی | ٢٢٦<br>٢٨٨-٢٨٦<br>٢٩٠-٢٨٩<br>٣٠٠-٢٩١<br>٣٥٠ |
| ٣٥ | ١-هونەرە جوانەکانی مندالآن/ مێژگرد<br>٢-ریپۆرتاژەك ل دۆر شانۆیا زارۆکا ل دهۆکێ/ مێزگرد<br>٣-لەبارەی مۆسیقاو گۆرانیی مندالآن | <br><br>نایف محەمەد | ١١٢-١٠٦<br>١١٤-١١٣<br>٢٣٦ |
| ٣٦ | منداڵ و تاوان لە نێوان بۆماوە و ژینگەدا | ئامانج عوسمان حەمەد | ٢٠٦-٢٠٥ |
| ٣٨ | ١-زەبری دەروونی و رۆڵی دایك و باوك لە کەمکردنەوەدیان<br>٢-مێژووی شانۆی بووکەڵە<br>٣-چی بۆ مندالآنمان بکەین؟ | کەریم شەریف قەرەچەتانی<br>عەبدولخالق قەرەداغی<br>نەشئەت هەولێری | ٤٥-٤٣<br>٢٣٠-٢٢٩<br>٢٩٥ |
| ٣٩ | والّت دیزنی، خەونی ئەرخەوانیی مندالآن | سەفەر عەلی | ٢٩٨-٢٩٧ |
| ٤٠ | ١-هونەرمەندێ زارۆك شەمیر نەسرۆ و چەند پەیڤەك/ دیمانە<br>٢-مێو جگەرگۆشەکەم | <br>لێدوانی/ رۆستەم باجەلان | ٢٩٦<br>٣٢٣-٣٢٠ |
| ٤١ | ١-رەفتاری شەڕەنگێزی لەلای منداڵ<br>٢-گرۆگالّی مندالآنی کورد<br>٣-دوو کتێبی مندالآن | د. یووسف حەمەسالّح<br><br>لێدوانی/ رۆستەم باجەلان | ٥٩-٥٦<br>٢٢٠-٢١٥<br>٣٠٩-٣٠٨ |
| ٤٢ | ١-گەشەپێدان و پێشخستنی بەهرەی منداڵ | نووری بێخالّی<br>د. عومەر پەتی | ٨٩-٨٥<br>١٤٩-١٤٨ |

| | ٢-لەبارەی بەهرەودرانەوە<br>٣-چیرۆکنووسی منداڵان سەمەدی بەهرەنگی<br>٤-پیرەمێردێکی ریش درێژبوو | و. شاخەوان عەزیزی<br>لێدوانی/ ڕۆستەم باجەلان | ١٥٢-١٥٤<br>٣١٥-٣١٦ |
|---|---|---|---|
| ٤٣ | دوو کتێبی منداڵان | لێدوانی/ ڕۆستەم باجەلان | ٣٢٤-٣٢٧ |
| ٤٤ | ڕۆشنبیری منداڵان | لێدوانی/ ڕۆستەم باجەلان | ٢٩٢-٢٩٤ |
| ٤٥ | ١-چەمکێك لە مێژووی گۆڤارو چیرۆکی منداڵان/ بەشی یەکەم<br>٢-ڕۆستەم حەویزی شاعیرو سروودی قوتابیان<br>٣-جریوە | عەبدولخالق قەرەداغی<br>د. کەمال مەعرووف<br>لێدوانی/ ڕۆستەم باجەلان | ١٤٧-١٤٩<br>١٥٨-١٥٩<br>٣٠٤-٣٠٧ |
| ٤٦ | شانۆی فێرکردنی منداڵان | جەمال گردەسووری | ٣٢٥ |
| ٤٧ | ڕۆژنامەگەریی منداڵان لە عێراقدا | لێدوان/ ڕۆستەم باجەلان | ٣١٥-٣١٧ |
| ٤٨ | هانز کریستیان ئەندرسن و ئەدەبی منداڵان | دلێر ئیبراهیم | ٢٩٦ |

دوای تەواوبوونی ئەو گەشتە بەناو لاپەڕەکانی هەر (٤٨) ژمارەی گۆڤارەکەدا، ئەم چەند خاڵانەمان بۆ روونبووەوە:

١- زۆربەی ژمارەکانی گۆڤارەکە بابەتی منداڵانیان تێدا بڵاوکراوەتەوە تەنیا ژمارە (٢، ٨، ١٣، ٢١، ٢٣، ٢٦، ٢٨ و ٣٧) نەبێت.

٢- زۆرترین ژمارەی بابەت لە ژمارە (٣٣ و ٣٤)ە، کە هەریەکەیان پێنج بابەتی منداڵانی بەخۆیەوە گرتووە.

٣- ڕێژەی بابەتەکانی تایبەت بە منداڵان بەرامبەر بە سەرجەم بابەتەکانی گۆڤارەکە بەلاپەڕە نزیکە١/٤٧ دەبێت.

٤- دریژترین بابەتی منداڵان لە گۆڤارەکەدا رۆمانی (دەریای منداڵان)ە کە لەلایەن رۆستەم باجەلانەوە نووسراوە و لە ژمارە (٣، ٤، ٥)دا بڵاوکراوەتەوە و ١٦ لاپەڕەی بەخۆیەوە گرتووە.

٥- زۆربەی بابەتەکان بۆ گەورە نووسراون نەك راستەوخۆ بۆ منداڵ، ئەمەش لەگەڵ رەوتی گۆڤارەکەدا دەگونجێ، چونکە وەکو گوتمان گۆڤارەکە هی منداڵان نییە.

٦- گۆڤاری (رامان) شیعری منداڵانی بڵاونەکردووەتەوە، سەبارەت بە چیرۆکیش، زۆربەی چیرۆکەکان بۆ منداڵی تەمەن سەرووی (١٠) ساڵانن، ئەمەش هەر لەبەر ئەوەیە کە گۆڤارەکە بۆ منداڵان نییە.

٧- (رامان) گرنگیی بە شانۆ و شانۆگەریی منداڵان داوە، ئەمەش کارێکی باشە.

# بیبلیۆگرافیای بابەتی رۆژنامەنووسییەکان لە هەشتاکاندا*

# ١٩٨٠ — ١٩٨٩

ئاشکرایە کە لە دوای راپەرینی بەهاری سالّی (١٩٩١)ەوە گرنگییەکی شیاو بە رۆژنامەنووسیی کوردی دەدرێ و زۆرکەس لە نووسەر و پسپۆڕ و قوتابیانی زانکۆ و خوێندنی بالاّ دەیانەوێ باس و لێکۆڵینەوە لەبارەی رۆژنامەنووسیی کوردییەوە بنووسن، بۆیە دەستنیشانکردنی ئەو سەرچاوانەی بابەتی رۆژنامەنووسییان تێدا نووسراوە کاری ئەو کەسانە ئاسانتر دەکات و دەبێتە یارمەتیدەرێك بۆیان.

دیارە ئامادەکردنی بیبلۆگرافیایەکی تێروتەسەل بۆ سەرجەم بابەتە رۆژنامەنووسییەکانی تەمەن زیاتر لە (١٠١) سالّ کارێکی ئاسان نییە، ئەمە بوارێکی گونجاو و کاتێکی زۆر و نووسینێکی دوور و درێژ و خۆتەرخانکردنی پێدەوێ.. بۆیە وەکو هەنگاوی یەکەم بە پێویستم زانی ئەم بیبلیۆگرافیایە لەبارەی ئەو بابەتە رۆژنامەنووسییانە ئامادە بکەم کە لە سالاّنی هەشتاکاندا لە ١٩٨٠/١/١ هەتا ١٩٨٩/١٢/٣١ لە رۆژنامە و گۆڤارەکانی کوردستانی خواروو و عێراقدا بلاّوکراونەتەوە، چونکە خوێنەری ئێستا بە زەحمەتتر دەتوانێت دەستی بەو هەموو بلاّوکراوانەدا رابگات کە لە ماوەی دە سالّەکەدا بلاّوکراونەتەوە، بە پێچەوانەی بلاّوکراوەکانی دوای راپەرین کە تەمەنیان تازەتر و بەدەستکەوتنیشیان ئاسانترە.. پێش ئەوەی خوێنەری بەرێزیش ئەم بیبلیۆگرافیایە بخوێنێتەوە دەمەوێ ئەم خالاّنە روون بکەمەوە:

١- ئەم بیبلیۆگرافیایە نزیکەی (١٧٠) بابەتی رۆژنامەنووسیی گرتووەتەوە، ئەمەش هەموو ئەو بابەتانە نین کە لە ماوەی دە سالّەکەدا لەبارەی رۆژنامەنووسیی کوردییەوە نووسرابن، بەلاّم بەشی هەرە زۆریەتی.

٢- تەنیا ئەو بابەتانەی بەخۆوە گرتووە کە بە زمانی کوردی نووسراون.

٣- ئەو پیرۆزبایی و هۆنراوە و چاوپێکەوتنانەم فەرامۆش کردووە کە بە بۆنەی دەرچوون یان بیرەوەریی دەرچوونی رۆژنامە و گۆڤارەکانەوە نووسراون، تەنیا ئەو پیرۆزباییە بە کۆمەڵانە نەبێ کە ژمارەیان لە بڵاوکراوەیەکدا زۆرە و زانینیان بێ سوود نییە، ئەوانیش تەنیا ئاماژەم پێکردوون و بەس، بۆ وێنە لە رۆژنامەی (هاوکاری) ژمارە ١٠٤٠ لە ١٩٨٩/١/١٩ بەبۆنەی بیرەوەریی نۆزدە ساڵەی دەرچوونی رۆژنامەکە (٥٧) پیرۆزبایی و کورتیلە وتار بڵاوکراونەتەوە.. ئەمە و چەند حاڵەتێکی دیکەی لەم بابەتە ئاماژەیان پێکراوە.

٤- بابەتەکان ساڵ بە ساڵ لە یەك جیاکراونەتەوە و لە هەر ساڵێکیش ئەوەندەی کرابێ بە پێی رۆژی دەرچوونیان بڵاوکراونەتەوە و بەم شێوەیەی خوارەوە:

## ساڵی ١٩٨٠

١- یادی هەشتاو دوو ساڵەی رۆژنامەگەریی کوردی.

وتارێکە لەبارەی رۆژنامەی (کوردستان) و بیرەوەریی ٨٢ ساڵەی رۆژنامەنووسیی کوردی.

سەرچاوە/ رۆژنامەی (عێراق) ژ٣٥، ئادارو نیسانی ١٩٨٠، ل٢.

٢- ٢٢ی نیسان نیشانەیەکی نەمرە لە مێژووی رۆژنامەنووسیی کوردیدا.

وتارێکی رۆژنامەنووسییە لەبارەی رۆژنامەی (کوردستان)ی ساڵانی ١٨٩٨-١٩٠٢.

ناوی نووسەر/ مومتاز حەیدەری

سەرچاوە/ گۆڤاری (نووسەری نوێ)، ژ٥، ئەیلوولی ١٩٨٠، ل٥-٧.

٣- بەبۆنەی دەرچوونی (نووسەری کورد)ەوە.

بابەتێکە بەبۆنەی دەرچوونەوەی گۆڤاری (نووسەری کورد) و رێکخستنەوەی یەکێتیی نووسەرانی کورد نووسراوە.

ناوی نووسەر/ دوکتۆر جەمال نەبەز.

سەرچاوە/ گۆڤاری (نووسەری کورد) خولی دووەم، ژ٥، تشرینی دووەمی ١٩٨٠، ل٦-٧.

## ساڵی ١٩٨١

١- مستەفا شەوقی و پەیژە.

باسێکی فراوانە لەبارەی گۆڤاری (پەیژە) کە مستەفا شەوقی لە ساڵی ١٩٢٧ دەریکردووە.

ناوی نووسەر/ مومتاز حەیدەری.

سەرچاوە/ گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)، ژ٨٣، کانوونی دووەمی ١٩٨١، ل٤٨-٦١.

٢- دابونەریتی مامەڵە لەگەڵ رۆژنامە.

بابەتێکە لەبارەی ناردنی وتارێك بۆ زیاتر لە رۆژنامەیەك.

ناوی نووسەری لەسەر نییە.

سەرچاوە/ گۆڤاری (نووسەری کورد)، خولی دووەم، ژ٦، شوباتی ١٩٨١، ل١٩٢-١٩٣.

## ساڵی ١٩٨٢

١- کاروان

وتارێکە لەبارەی کاروان و گۆڤاری (کاروان)

ناوی نووسەر/ حوسێن رەشوانی.

سەرچاوە/ گۆڤاری (کاروان)، ژ١، تشرینی یەکەمی ١٩٨٢، ل٣٨-٣٩.

## ساڵی ١٩٨٣

١- کاروان.. (کاروان)

وتارێکە لە بارەی رۆڵی رۆژنامەنووسی بەگشتی و گۆڤاری (کاروان) بەتایبەتی.

ناوی نووسەر/ بابەکر پشدەری.

سەرچاوە/ گۆڤاری (کاروان)، ژ٧، نیسانی ١٩٨٣، ل٧-٨.

٢- بۆ ئەم ژمارەیەش

وتارێکە لەبارەی باری دەرچوونی گۆڤاری (نووسەری کورد) و ئەو تەنگوچەڵەمانەی دەخرێنە بەردەم گۆڤارەکەوە.

ناوی نووسەر/ دوکتۆر عیزەدین مستەفا رەسووڵ.

سەرچاوە/ گۆڤاری (نووسەری کورد) خولی دووەم، ژ١٢، ئابی ١٩٨٣، ل٣-٦.

٣- ئەمرۆ و دوێنێی رۆژنامەنووسیی کوردی.

بابەتێکە لەبارەی کاروانی سەخت و بێ پسانەوەی رۆژنامەنووسیی کوردی.

ناوی نووسەر/ محەمەدی مەلا کەریم.

سەرچاوە/ گۆڤاری (نووسەری کورد) خولی دووەم، ژ١٢، ئابی ١٩٨٣، ل٢١٣-٢٣٦.

##ساڵی ١٩٨٤

١- خالبەندی دگۆڤارا (رۆژی کورد) دا ١٩١٣

بابەتێکی زمانەوانییە لەبارەی خاڵبەندی لە گۆڤارەکەدا

ناوی نووسەر/ حجی جەعفەر

سەرچاوە/ گۆڤاری (کاروان)، ژ٢٠، مایسی ١٩٨٤، ل٣١-٣٣.

٢- رۆژی کورد رۆژەکا گەش بوو.

بابەتێکە لەبارەی گۆڤاری (رۆژی کورد) و بابەتێکی (حجی جەعفەر) لەسەر گۆڤارەکە.

ناوی نووسەر/ رەشید فندی.

سەرچاوە/ گۆڤاری (بەیان)، ژ١٠١ و ١٠٢، کانوونی یەکەمی ١٩٨٤، ل٢٤٤-٢٤٨.

## ساڵی ١٩٨٥

١- لەگەڵ کاروانی رۆشنبیریی کوردی لە بیستەکان و سییەکاندا و بەراوردکردنێك.

